


# سەعدی شیرازی





ئوستادی پەیڤ

گەشتێک بە نێو ژیان و ئەدەبیاتی عیرفانی، ئەخلاقیی باخی شیرازیدا



وەرگێڕانی: مەهدی عەبدوڵڵا

دکتۆر مەنوچەهر دانش پژوە

# سەعدی شیرازی

## گەشتێك بە نێو ژیان و ئەدەبیاتی عیرفانی، ئەخلاقیی باخی شیرازێدا

# ئوستادی پەیڤ

٤

وەرگێڕانی:
محەمەدی عەبدوڵڵا






سایە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سەعدی شیرازی

ناوی کتێب: سەعدی ئوستادی پەیڤ

نوسینی: دکتۆر مەنوچەهر دانش پژوه

بابەت: ژیاننامە و ئەدەبیاتی ئەخلاقی

وەرگێڕانی: مەهدی عەبدوڵڵا مەلا رەسول

دیزاین: فازیل کەولۆسی

تایپ: عومەر محمد مەلا رەسول

چاپخانەی: تاران

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم ٢٠١٨

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٦٠٠٠ دینار

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی( ١٦٩٩) ساڵی ٢٠١٧پێدراوە.

بۆ دەسکەوتنی بلاوکراوەکانی ناوەندی سایە بەتاکو کۆ..

ناونیشان: سلێمانی – شەقامی پیرەمێرد

Emil: saya.book@yahoo.com 07512460583







**پێشکەشە بە:**

**گیانی باپیرم، مەلا ڕەسوڵ باداوەیی، کە هەر بە منداڵی دوای قوڕئانی، لە باخچەی سەعدی، گوڵستانی پێشکەش کردم..**

هەزاران درود..

**وەرگێڕ**

# نێواخن



## شنەیەکی فێنك لە باخی گوڵستانی

دوازدە ساڵ بووم، باپیرم دەستی گرتم، بستوو بە بستوو ڕۆیشتین، تا گەیشتینە خاکی عەنبەر بۆی شیرازێ، لە نێو گوڵستانی تازە بەهاری جەنابی سەعدی، لە سێبەری گوڵە باخێکدا پشوویەکی بەهەشتین دا..

کاتێ بەیان دەنگوت، لە سەر کانیێ گوێزێ، پاڵی وە پیرە گوێزێ دەدا، زمزمەی کانی و هاژەی کارێز کە دەرژایە قەدی چنار و سپیدار و باخچەکان، ئەمنیش لەسەر بەردوچکەیەك هەڵدەتروشکام، کە تاویش خۆشدەبوو لەبەر بەرۆچکێ مزگەوتێ. گوڵستانی خۆش تام، تەڕ و توش و کرێوە و چرقەی گەرمای دایم زەردەپەڕی بەهار بوو. جەنگەی شەڕ و شۆڕ و قاتی برستی هێنا بوو، شاد ڕەوان بۆ ئۆخژنی گیان و پەروەردەی قوتابیەکەی ئامێزە گوڵی لە گوڵستانێ دەچنی. ئەوێستا پاش تێپەڕینی عەیامێك بەسەر ئەو ڕۆژانەدا لە نوسینی ئەو چەند دێرە بۆنی غەریبی پڕ بە ژورەکەم شەپۆلان دەدا، گوڵێکی پڕ گەرووی گرتووم، پەنجەی شەرمم دێنە لەرزین..

دەرس بە دەرس، سێ ساڵان دەو باخەدا لە شنە و شەماڵی شاد و شەیدایی بووین، لە بن هەر ئەمامێ پشوویەك و لە هەر دێراوێ




چلێك و لە هەر گوڵێ بۆنێك و لە هەر كانیێ قمێك.. عەجەب باخ و باخەوانێك..!

هەر لە كۆنەوە لە ناوچەی كوردەواری لە حوجرەگان، بە دوا قورئانێدا، گوڵستانی سەعدی كە تەفسیری ئەخلاقیەتی، وەك دەرسێكی ئەدەبی و پەروەردەی فەقێی لاو، یەك لە ماددە هەوەڵینە گرینگەكان بووە، تاوەكو لە هەرەتی لاویدا ئینسانێكی دەرون ساغ و رۆحێكی بالاو خۆرسكیی ناوچەی ئەدەبیات و رۆحانیەت بێ.

وێرای بەخشینی هزر و روانینێكی تەندروست و نەرم، زمان و راوێژێكی شیرین بە خوێنەر دەبەخشێ. لێرەوەیە نهێنی سادەیی و سپیەتی خوێندەوار و پیر و مەلای كۆن و دینداریی خۆماڵی و مزگەوت و منارەی مەعنەوی كورد. ئەدەبیات و ماریفەتە مێژووی ئاینی و ئینسان دۆستی ئێمەی خوڵقاندووە.

گوڵستان و میراتی سەعدی لێورێژە لە تاوو تینی عیشقی ئیلاهی و پەروەردەیەكی ئیمانی و ئەوجی خودا ناسی و مرۆڤ دۆستی، سەرشارە لە عیشقی ژیان و گەردوون و پێكەوە ژین و فرەیی بێ قرەی شاری و ژیاری، بونیادی بەرزە مرۆڤە، دەرونسازێكی ئەخلاقی بالای كامڵە.

وێرای بوێژی رەوان، هێز و پێزی ناسكی وشە و شێعر و بەخشانی سەعدی، تەژی لە مەعریفە و عیرفانە، ئەوجی خودا ناسی و مرۆڤ دۆستی لە خۆ گرتووە.. ئەو پیرە كۆنە ساڵە ئەوێستاش لە پشت سەدەكانەوە دەنگی شیرینی دێ.

ئالۆ گۆری دەورانی ژین و روداو گەلی هەشتسەد ساڵی رابردوو نەیتوانیوە باخی دلاوێزی سەعدی هەڵپروكێنێ، رەنگە رۆژگارێك لە سەر دەلاقە تەپوتۆزی لێ نیشتبێ، وەلێ هیچ وەخت بەرگی خەزانی






نەچووەتە بەرێ، تازەیی و شلکی و بۆنخۆشی ئەو باخی هەمیشە بەهارییە، هەروەك شێخی ئەجەل لە ستایشی گوڵستانێدا دەڵێ:

بە کەڵکی چی دێ داوێنە گوڵێ
لە گوڵستانی من ببە چەند چڵێ
گوڵ هەر پێنج شەش ڕۆژان دەمێنێ
گوڵستانی من دایم خۆش دەمێنێ

لێرەدا پێویستە بڵێم، بۆ دەقەکانی گوڵستان ڕوانیومەتەوە هەر یەك لە گوڵستانەکەی مەلا مستەفای سەفوەت و عەلی نانەوازادە و کەڵکم لێ هەڵکراندوون، وە بەڵام بۆ دەقە شێعریەکانی بۆستان پوختەی مانام لە شەرحی بوستانی سەعدی، وەرگێڕاوی موحەممەد ئەمین ئەمینیان، هەڵێنجاوە.

هیواداریین وەرگێڕانی ئەو کتێبەی دکتۆر مەنوچەهر _بە کەمێ دەستکاری و لێ زیاد کردنەوە_ سروە و شەماڵێکی بۆنخۆش لە نێو باخچەی ئەدەبیاتی ئەخلاقیی سەعدی هەڵیکردبێ و شەیدایانی عیشق و عیرفان هەناسەیەکی قوڵی لەبەر هەڵمژن، ئاهێکی خۆش لە دڵ و دەرون بگێڕێ، ببێتە دەروازەیەکی گرینگ بۆ سەعدی ناسی. بەو بۆنەیەوە داوەتی خوێنەران دەکەم کە بگەڕێنەوە نێو فەرهەنگ و باخ و گوڵستانی سەعدی و پێ و شوێنی مەعنەویەت کە برینی گەورەی ڕۆحی و ئەخلاقی چارەسەر دەکات..




**هەروەك پێویستە پێزانینی خۆم بۆ نێوەندی سایە دەربڕم کە شاباڵی خۆی کردەوە و ئەرکی لە چاپدانی وەخۆ گرت، خودا سایە و سێبەریان هەردەم تەڕ و فێنك بێ..**

**لە کەمایەسی عوزر خوازیی دێنینەوە، چاکە لە خوداوەیە و بێ کەڵك لە منە، ماڵی قلبیش سەر وە سەحەبیەتی.**

**وما توفيقي الا بالله**

**مەهدی عەبدوڵڵا / پشدەر، باداوە**

**گوڵانی ٢٠١٧**

## دەستپێك

قسەکردن لە مەڕ سەعدی، هەم سەخت و هەمیش ئاسان، بە دیوێکدا ئاسانە، چونکە هەموو فارسی زبانێك، زمان و ئاخاوتن لە سەعدی فێر بووە. وەلێ لە سەرێکی تر باسی سەعدی دشوارە, چون هەر کێ دەربارەی بدوێ، سیلەیەکی لە پێگەی سەعدی کەشف کردووە, هەر کەسەو لە پەنجەرەی بیر و تێڕوانینی خۆی دەڕوانێ و بووەتە یاری وی، سەعدی کامڵیی فرە دشوارە.

ئەو چەند پەڕە، داوێنە گوڵێکە، قەرتاڵە میوەیەکی خۆشتامی شیرازێ یە، کە لە باخچەی ئەدەبیاتی شیرین بەیانی هەمیشە گوڵستانی سەعدی چنراوە، چەردێکە لە ژیان و فیکری ئوستادی سوخەن، پێشکەشە بە تەواوی دۆستدارانی ئەدەبیاتی عیشق و عیرفان، بەتایبەت گەنج و لاوانی شیرین جەماڵ.

ئەو چەند دێڕە مەڵۆێکە لە خەلە و خەرمانی پڕ بەرەکەتی ئوستادی پەروەردە و ئەخلاق حەزرەتی سەعدی، گوزارشت نیە لە دەریای بێ بنی شێعر و پەخشانی باوکی زمان و ئەدەبیاتی فارسی.

خۆ ئەگەر تینوانی فەرهەنگ و کەلەپوری شیرازیی پاراویش نەکا، بیگومان ئەوانەی بە سەرچاوەی فەیزی وی ڕێ دەبەن، تامەزرۆیەکی زۆر دەشکێنێ.

**مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی جوانی فەرمووە:**

**آب دریــــــا اگـــر نتــوان کـشید**

**هـم به قدر تشنگی بـــــــاید چشید**

**ئاوی دەریا گەر ناتوانی تەواوی بکێشی**

**بـە ئەندازەی تینویەتی دەبێ بینۆشی**

**مەنوچەهر دانش پژوهـ**

**هاوینی ١٣٨٧ هەتاوی**



# ژیـــــن نـــــامـــــە

باس باسی سەعدییە[1]، هەموو ئەو نوسەر و شاعیرانەی فارسی زمانن و بە شیرینترن پەیڤ دەدوێن و دەنوسن, قەرزداری زمان و شێعری سەعدی، شێخی ئەجەلن. پێشینانی ئێمە سەعدیان بە ( پاراوترین بوێژ_ افصح المتکلمین، ئوستادی پەیڤ، شێخی ئەجەل ) ناودێر کردووە. لە ڕاستیدا ئەو وەسفەی سەعدی پڕ بە نامێزێ نیە, بە باوەڕی تەواوی ئەهلی ئەدەبی فارسی، شیرازی یەکێکە لە چوار قەلاّ گەورەگەی شێعری فارسی و بە لای بڕێ لە ساحێب نەزەرانیش، گەورەترین شاعیری ئێرانە. ئەو چوار قەلاّیەش، نە لە تەنیا ئێران و نزیکی ئێران ئێوو ئێوبانگیان هەیە, بەلّکە دەنگ و شێعری ئەوان مەرزی ئێرانی تێپەڕاندووە و بە پانایی زەوییدا بلاّو بونەتەوە.

هەروەتر بوونەتە ئیلهام بەخشی شاعیرانی تریش، کە بە پێی مێژووی لەدایکبوونیان بریتین لە:

فیردەوسی، لەدایك بووی ۳۲۹ هیجری قەمەری -٤١١ کۆچی.
١

---

[1]. سەعدی، ناوی موسلیح عەبدوڵلا شیرازیە، سەعدی نازناوی شێعری و ئەدەبیە، لەدایك بووی ساڵی ٦٠١ کۆچی، ساڵی ٦٩٠ وەفاتی کردووە، مەزهەب شافعی و باوەڕ ئەشعەری، دەرچوی قوتابخانەی نیزامیەی بەغدا، لە ژێر کاریگەری فیکری ئەبوحامیدی غەزالی خاوەنی ئیحیای علومی دین. سەعدی خاوەنی گوڵستان و بوستان و غەزەلیاتی بێ وێنەیە، بە کولیاتی سەعدی ناودێرە. لەسەردەمی ئەتابەکانی فارس، عەباسیەکان، خارەزمشاهاندا ژیاوە. شوێنەواری بەسەر هەر یەك لە حافیزو ئەمیر خوسرەو و دەهلەوی و گۆتەی ئەلّمانی و. زۆری تردا هەبووە.

سەعدی، لەدایك بووی كۆتا چەرخی شەشەمی كۆچی، وەفاتی لە ٦٩١. مەولەوی، لەدایك بووی ٦٠٤ , وەفاتی ٦٧٢. حافیز، لەدایك بووی سەرەتاكانی چەرخی هەشتەمی كۆچی، وەفاتی لە ٧٩٢ كۆچی. بێ ئەوەی بمەوێ سەعدی لە سەرەوەی گەورە شاعیرانی فارسی دانێم، پێویستە بگوترێ كاریگەری زمان و شێعری سەعدی لە گەورە ئەدیبانی فارسی تر بەسەر فارسی زمانانندا پترە. وێڕای ئەو چوار قەلأیەی نێوم هێنان، گەورە پیاوانی تری شێعر و ئەدەبیاتی فارسی، وەك ( نیزامی، عەتار، خەیام، خاقانی، ئەنوەری، ڕودەكی ) زۆرێكی تر، تێكڕایان پەروەردەی ئەدەب و ڕەوشت و حیكمەتن، كە پتر لە هەزار ساڵە بۆ فارسی زمانان و خەڵكی دی بوونەتە كانیاوی ئەدەب و ڕەوشت.. ئەدەب لە زمانی فارسیدا بە دوو مانا هاتووە: بە مانای ئەدەبیات و پەروەردە، لێرەدا هەردوو مانا لە ئاساری سەعدیدا هەیە و بە ئەوجی كەماڵی خۆی گەیشتووە. میراتی سەعدی لە هەر كتێبێكی تر شوێن پێی زیاتری بەسەر زمان و ئەدەبیاتی فارسیەوە جێ هێشتووە، هاوكات فێركارییەكی مەزنی بابەتی ئەخلاقی و مەعریفەشە، كە بە عیرفانی كرداری نێوی براوە. شیرازی لە هەر شاعیرێكی دی وەزیفەی مامۆستای ئەخلاق و پەروەردەو مەعریفەی لە خۆ گرتووە.

لە ئێرانێ شێعر بالأترین هونەرە، لە نێو پەیف و وتەدا جێی لە سەرێیە، غەزەلەكانی سەعدی و حافیزیش بالأترین هونەری ئێرانیە. حافیز لەگەڵ شێعردا نەقاشی دەكات، نەقشەكەی لە قەڵەم و ڕەنگی هەر نیگاركێشێك جوانترە و هەموو هونەر ناسێك نەقشی حافیز لە وێنەی هەر نەقاشێك لەپێشتر دەبینن، هەروەك دەگەڵ خۆیدا دەڵێ:





هر کـــو نکند فهمی زیـــــــــــــــن کلك خیال انگیز
نقش به حــــــرام ار خــــود صورتگر چیــــن باشد

گەر درکی قەڵەمی پڕ لە جوانی و خەیاڵ ئەنگێز نەکا کەسێ
دەبــەنگـــە، نــەگــەر نیگـــار کێشی چینیش بــــێ

شێعر, بڕێ لە هونەرەکانی تری لە نـاوەوە و دەرەوەی لـە خـۆ گرتـووە, وێنە و خـەیاڵی شاعیر هونـەرێکی مەعنەوییـە، کـە وێنەیـەکی دەرەکی لــە خەیاڵــدانی ئینسـان دروسـتدەکات، ئـاواز و وەزنــی شـێعرەکەش هونــەری دەرەوەیــەتی. دەکـرێ بگـوترێ مۆسـیقای شـێعر لـە کایـەی هونـەردا دڵنـەوازترین ئاهـەنگ و ئـاوازی مۆسـیقایە، بـە تایبـەت کـە سـەعدی لـەو ڕووەوە سەرمەشقی تـەواوی شـاعیرانی خـۆش نـەوا و دڵ بزوێنــە، گـوێ و دڵ خۆشـکەرە, سەرشـارە لـە ئەشـق و جـوانی و دڵـب هنـدی، غــەزەلی سـەعدی ســەرلەوحەی تــەواوی غەزەلــەکانی خــۆش ئاهەنگی فارسییە، کە حافیزی مەزن بە ئوستادی غەزەلی نێو بردووە.

استـــــــاد غزل سعدی است نزد هرکس امـــا
دارد ســــخــن حــــافظ طرز سخن خــــواجۆ
لەلای هەمــــوان ئوستادی غــەزەل ســەعدیە
وەلێ حافیزیش جەشنی خواجە، غەزەلی هەیە





## دەورانی ژین و سەردەمی سەعدی

یەك لەو خالآنەی كە لە ناسینی مەزنانی زانست و ئەدەبدا جێی لەبەرچاو گرتنە، ساتە وەختی هاتنە دونیا و ڕۆژانی ژین و مێژوی وەفاتیانە. بێگومان گرینگی ئەو خاڵە لەوەدایە دەورانی ژینی هەر شاعیرێك، هونەرمەند، یا بیرمەندێك، كاریگەری ڕاستەوخۆ بە سەر شوێنەواری نوسین و بەرهەمەكانیەوە دروست دەكات. هەروەك زانینی لەدایك بوون و زەمانی وەفاتی هەر یەكێكیان خاڵێكی گرینگە بۆ ناسینی بار و حاڵی ژیانی, سەرەكیترین خاڵیشە لە بابەتی توێژینەوەی بەیانی حاڵی مەزنان.

لە ڕاستیدا توێژەرانی دەورانی زیندەگی سەعدی، ئەو پرسەیان نەیانگەیاندۆتە بناوانێ، بەتایبەت مێژوی لەدایك بوون و وەفاتی، چونكە درێژی تەمەنی سەعدی و سەیر و سەفەرە فراوان و دوورەكانی وایكردووە سالآنێكی زۆر لە شار و زێدی خۆی دووركەوێتەوە و دەگەڵ هاوتەمەنە دیارەكانی خۆی ئاگایەكی ئەوتۆ نەماوە, لەبەر ئەوە لە چاو مەزنانی تری شێعر و ئەدەبی فارسی دەورانی ژینی سەعدی ڕاجیایی لێ كەوتۆتەوە.






لێکۆڵەران بۆ بەدەستهێنانی مێژووی لەدایکبوونی شیرازی، سەیری نێوەڕۆکی گوڵستان و بوستان دەکەن، چوون لە هێندێ جێدا ئاماژەی بە پەنجاساڵی و حەفتا ساڵی خۆی کردووە [٢].

هەروەك هێندێ ئاماژە هەیە کە نوسینی بوستانەکەی لە ساڵی ٦٥٥ کۆچی و گوڵستانەکەشی لە ساڵی ٦٥٦ کۆچیدا بووە [٣].

ئەوەی لە بەلگە و ئاماژەکان لە شێعر و گوتەکانی سەعدی و شوێنی دیکە چنگ دەکەوێ، لەدایکبوون و مردنی لە نێوان ساڵانی ٥٧٠ تا ٦٩١ کۆچی، دەورانی تەمەنی شیرازی تەخمین کراوە. دەگوترێ تەمەنی شیرازی نەوت ساڵ تا سەد و بیست ساڵ بووە، تەواوی توێژەران بڕوایان وایە تەمەنی درێژی سەعدی هۆی ئەو لێڵی و دیار نەبوونی ساڵانی ژینیەتی.

لە ڕاستیدا ساڵی ٥٧٠ بۆ لەدایك بوونی، جێی قەبوڵی زۆرینەی توێژەران نیە. کۆتایی چەرخی شەشەمی کۆچی واتە لە ساڵی ٥٨٥ کۆچی بەولاوە تا سەرەتای چەرخی حەوتەم، ئەو ساڵانەن کە پتر

---

[٢]. ای کە پنجاه رفت و در خوابی
مگر این پنج روزە دریابی
گلستان.
بیا ای کە عمرت بە هفتاد رفت
مگر خفتە بودی کە بر باد رفت
بوستان.

[٣]. زشصد فزون بود پنجاه و پنج
کە پر در شد این نامردار گنج
بوستان.






هەژمارکراون. بەڵام بۆ کۆچی دوایی سەعدی کەمتر ڕاجیایی هەیە، ئەوەی کە هەشە لەنێوان ساڵانی ٦٩١ بۆ ٦٩٥ کۆچیدایە.

ڕەوان شاد سەعید نەفیسی لە توێژینەوەکەیدا بە بەڵگە دەیسەلمێنێ کە وەفاتی شیرازی لە ساڵی ٦٩١ دا بووە و دروسترین مێژوویەتی.

زیندەگی سەعدی هاوزەمانە لەگەڵ ڕۆژانی حوکومەتی ( ئەتابەکی فارس )[٤]، بەتایبەت دوای گەڕانەوەی لە سەفەری تولانی کە پتر لە سی ساڵی خایاندووە, ستایشی ئەتابەکی کردووە و بە باڵایدا هەڵگوتوە, چونکە ئەتابەك مایەی ئاشتی و ئارامی شار و وەڵات بووە. ئەوکاتەی سەعدی لە شیرازێ بار دەکا، هەروەك لە قەسیدەیەکیدا باسی دەکا و دەڵێ: شار پڕ ببوو لە شەڕ و شۆڕ و نائارامی, وەلێ کە هاتمەوە، خاك و خەڵکم لە ئاسایش و ئاسودەیدا دیەوە, لە چۆنیەتی ئەو ئاسایشەم پرسی و فاکتەری بەرقەراری ئارامی و ئاشتیم زانی و ناسی.

وجودم به تنگ آمد از جور تنگی
شـــــدم در سفر روزگاری درنگی[٥]

---

[٤]. سەلغوریان گرۆپەکن لە تورکومان لە چەرخی دوازدەی زاینی حوکمڕانی ئێرانیان کردووە، دواجار بە دەستی مەغۆلەکان حکومەتی ئەتابەکەکان ڕوخاوە، سەعدی هاو زەمانی مەبوبەکری سەعدی ئەتابەك بووە، کە خاوەن سیاسەت و عەداڵەت و فەرمانڕەوایەکی باش بووە.

[٥]. جهان زیر سکندر بریدم ، جو یاجوج بگذاشتم از سد سنگی
برون جستم از ترك تركان جو دیدم ، جهان درهم افتاده جون موی زنگی
جو باز آمدم كشور آسوده دیدم ، ز گرگان به در رفته آن تیز جنگی
خط ماه رویان جو مشك تتاری ، سر زلف خوبان درع فرنگی
بنام ایزد آباد و ناز و نعمت، پلنگان رها كرده خوی پلنگی
درون مردمی جون ملك نیك محضر، برون لشكری جون هزبران جنگی
بپرسیدم این كشور آسوده كی شد؟ كسی گفت: سعدی جه شوریده رنگی






ئەو قەسیدە و قەسیدەکانی تری سەعدی، ئەو خاڵەمان پیشان دەدا کە ستایشەکانی سەعدی بۆ ( ئەتابەکەکان ) چەشنی هێندێ لە مەدح و پێداهەڵدانی شاعیرانی مەداح نیە، هەروەك ئەسڵەن سەعدی مەداح خوێن نەبووە، هەزاری نەبوونی هەڵبژاردووە بەسەر ئەوەی نان و قوت لە مەدح خوێنیەوە پەیدا بکات هەروەك خۆی باسی دەکات، بەڵکو ڕێز و ڕاست دیتن و سپاسێکە لە لایەن خەڵکەوە بۆ کەسانێك کە بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگا و نیشتیمانی خۆیان پشتێنی هیممەتیان بەستووە، ئەو تەرزە شێعرانەی سەعدی لە بابەتی سوپاس و پێزانینە لە بەرامبەر کارە چاك و شایستەکاندا، ئەوەش کە هاندەری چاکەکارانە لەسەر چاکەیان. گرینگی کاری سەعدی ئەو کاتە ڕۆشنتر دەبێ کە زەمانی ژینی وی بزانین و بناسین.

" جەنابی سەعدی کاتێ مەدحی ئەتابەك ئەبوبکری کوڕی سەعدی کردووە وەکو فەخرێك بۆخۆی دەڵێ ئەوە جەنابی پاشا بەختی هەبووە کە سەعدی کەوتۆتە دەورانی ئەو، هەروەك لەسەرەتای بۆستاندا دەڵێ:

مرا طبع زین نوع خواهان نبود

سر مدحت پادشاهان نبود

ولی نظم کردم بنام فلان

مگر باز گویند صاحب دلان

---

چنان بود در عهد اول که دیدی، جهانی پر آشوب و تشویش و تنگی

چنین شد در ایام سلطان عادل، اتابك ابوبکر بن سعد زنگی





**که سعدی که گویی بلاغت ربود**

**در ایام بوبکری بنی سعـد بود**

**هم از بخت فرخنده فرجام تست**

**کـه تاریخ سعدی در ایـــم تست**

واتا: حەزم لەو چەشنە پێدا هەڵگوتنەی نە ئەمم نەبوو، بەتایبەت بە شـان و بـاڵ هـەڵاگوتنی پاشـایان، بـەڵام ئـەو کتێبـەم کـە بـە نـاوی ئەبوبەکری سەعد دانـاوە، بەڵکو خـاوەن دڵان قسەیەکی لەسەر بکەن، واتـا نـاوی ئـەو پاشایە بێـنن و نـاوی بمێنێ، سـەعدی کـە ڕەوانبێـژی بردۆتـەوە، لـە ڕۆژگاری بوبـەکری کوڕی سـەعد بـووە. پاشـان ئـەوە لـە بـەختی پـیرۆزی تۆیـە جـەنابی شـا کـە مێـژووی سـەعدی کەوتۆتـە دەورانی تۆ.[٦]

سەعدی لە تاریکترین دەورانی مێژووی ئێرانێدا ژیاوە, ڕۆژگارێك کـە هێرشـــە وێرانکـــەرەکانی مـــەغۆل نـــە تـــەنیا بۆســـەر ئینســـان و ئاوەدانییـــەکان بـــووە, تەنانـــەت ڕەحمیـــان بـــەهیچ گیانـــدارێکیش نـــەکردووە. دەورانـــی نێوجـــەوانی و لاوی ســـەعدی لـــە ســـاتە وەختـــی دەستپێکردنی هێرشـەکانی مەغۆلدایـە، هـەوەڵین هەڵەمەتیشیان سـاڵی ٦١٦ نوسـراوە. خـۆ ئەگـەر لـە دایـك بـوونی سـەعدی لـە کۆتاییـەکانی چەرخی شەشەم بوبێ, ئەو کات سەعدی لە دەوری بیست ساڵیدا بـووە، وە ئەگـەریش بـە قسـەی هەنـدێ نووسـەر لـەدایك بوونەکـەی سـاڵی ٦١٦ بوبێ, ئەو وەختـە دە ساڵان بووە، هـەر لـە هـەرەتی منـداڵی پێکـدادان و

[٦] . دکتۆر عەبدولکەریم سروش لە باسی سەعدی شیرین پەیڤدا_ وەرگێڕ






وەحشەتی ئەو هەڵمەتە بێ ئەمانەی بیستووە و شوێنەوارەکەی بە چاوی خۆی دیوە.

هەڵبەت دوای خوێندنەوە و بیستنی وەحشەتی مەغۆلەکان سروشتی هەر ئینسانێکی خاوەن هەستی هێناوەتە لەرزە. سەعدی کە لەو بارودۆخ و زەمانەدا ژیوە کاریگەرییەکی قوڵی لەسەر دروستکردووە، رەنگە نیسحەت و رێنوێنی فەرمانرەوایانی زەمانی خۆی کە لە نێو گوڵستان و بۆستان و قەسیدەکانیدا باسی کردووە، دەرەنجامی کاریگەری ئەو دۆخە بوبێ، کە زوڵم و بێ رەحمی لە مێژوودا بە دەستی فەرمان رەوایان گەیشتۆتە دوندی ستەمکاری.

لە دەورانی هەڵمەت و پاکتاوی مەغۆلەکان زۆرێك لەوانەی توانا و دەست رۆیشتوو بوون خۆیان لە ئافاتی هێرشەکان دەربازکرد، وەلاتیان بە جێهێشت. ئەوانەی نێوو شوهرەتیان نیە لە مێژوودا باس نەکراون، بەلاَم لە مەزنانی زانست و ئەدەب و عیرفاندا، کەسانی وەك ( نجم الدين رازى , بهاالدين ولد –بابی مەولانا- مەولانا جلال الدين خۆی ) تەرکی زێدیان کردووە، بۆ ئەوەی لە بەلاَی مەغۆلان پارێزراو بن، رویان لە تورکیای ئێستا کردووە و لە قۆنیا نیشتەجێ بوون. "نجم الدين رازى" لە کتێبە بە نێوبانگە عیرفانیەکەیدا ماجەرای کۆچی خۆی دەگێرێتەوە و شەرحی حاڵی هەلاَتنی خۆی و مورییەی هاورێکانی دەکات. چونکە کاتێ روبەروو بونەوەی هێرشی مەغۆلەکان لە توانادا نەبوو، بێگومان بریاری ئاقلاَنە رۆیشتنە، گیانی عەزیز لە دەست نەدا بە زەلیلی، وەك عاریف و شاعیری نێودار " فەریدەدین عەتاری نیشاپوری " بەدەستی مەغۆلەکان بە کوشت نەچێ.



ڕەنگە سەعدی کە لە ساڵی ٦٢٣ بۆ تەواو کردنی خوێندنی ڕوی کردۆتە زانکۆی نیزامیەی بەغداد، سەنتەری زانستی ئەو ڕۆژگارە، هەم وەك کۆچ و هەمیش بۆ تەواوکردنی زانست بوو بێ.

مەولانا جەلالەدینی بەلخی بەرەو ڕۆم کۆچی کرد و لەوێ ڕۆنیشت، دواجار کە بە مەولانای ڕۆمی نێو دەردەکا و تا کۆتایی تەمەنی دوور لە زێدی خۆی (خۆراسانی گەورە ) لە قۆنیە دەمێنێتەوە و هەر لەوێش ماڵئاوایی لە دنیا دەکا و مەزاری ئەبەدی لەوێیە.

بەلآم سەعدی دوای سی ساڵ گەڕان بە هەگبەی پڕ، لە زانکۆی نیزامییە و گەشت و تەجرەبەی سەفەرە تولانیەکەی دەگەڕێتەوە ئامێزی شیرازێ، بە ئەزموونە کەم وێنەکەی هەریەك لە بوستان و گوڵستانێ لە دوو ساڵاندا دەنوسێ.

سەعدی خەڵکی وڵاتی خۆی لە چاو خەڵکی دونیا بەرزتر دەنرخێنێ، کە هەر ئەوەش بووەتە هۆی گەڕانەوەی بۆ شیرازێ:

در اقصای عالم بگشتم بسی
بسر بردم ایام با هر کسی

لە دوور وڵاتان گەشت و گەڕانم کرد
ڕۆژگارم دەگەڵ خەڵکی زاناو نەزان بەسەر برد

تمتع بە هر گوشەای یافتم
ز هر خرمنی، خوشەای یافتم

لە هەر قوژبنێك خۆشیم چنگ کەوت
لە هەر خەلەو خەرمانێك شتێکم دەستکەوت






چو پـــاكـــان شـــيـراز خـاكـی نهـــاد
نديدم كـه رحمت بـر ايـــن خـــاك بـاد

خـــاكی و چاكی چـەشنی پـاكـانی شیرازێ
کەسم نەدی، ڕەحمەت لــــه خـاكـی شیرازێ

تــولای مـــــردان ايـــن پـــاك بـــوم
بـرانـگـيـختـم خـــطـر از شـام و روم

خۆشەویستی خەلكـی پـــــاكی شیـرازێ
گــــەڕانـــدمـيەوە لـــە ڕۆم و شـامـــێ

دريــــغ آمـــــدم زان هـــمـه بـوســـتان
تـهی دســـــت رفتـــن ســـوی دوســـتان

پێم حـــەسرەت بـــوو لـــه بـاخ و بۆستـان
دەســـت بەتاڵ بگــەڕێمـــەوە لای دۆســـتان

به دل گفتــم: از مصـــر قـنـد آورند
بـــــــر دوستــــــن ارمغـــانی بـرند

بەدڵی خۆم وت له میسرێ قەندی بێنم
بیکەمه دیـاری بـــۆ خـۆشەویستـانم

مــــرا گر تهی بــود از آن قــنـد دست
ســـخــن هــای شیرین تر از قند هست

ئەگەر دەستیشم بـە تـاڵە لـە قەندی
پـەیڤی شیرین تــرم پێیە لـە قەندی

کـاتێ سـەعدی لــە ســاڵی ٦٥٥ ك، دەگەڕێتــەوە، تەمــەن و زانســت و ئـەزمونی گەیشتۆتە ئەوپـەڕی کـەماڵ, دەرفـەتێکی باشی ئەخشـاندنی شـوێنەواری ئـەو زانسـت و ئەزمونـە لـە گوڵسـتان و بوسـتانەکەیدا بـۆ هاتۆتــە پێشـێ، تـاوەکو شـیراز و تــەواوی ســەر زەمــین بــە بــاخ و گوڵزارەکەی بۆن خۆش و بگەشێنێ.

ئەڵبـەت سـەعدی لـە کـاتی خوێنـدن و گەشتەکەی دەرفـەتی بـۆ شـێعر نەبووە, کەمتر پرژاوەتە سەر بەرهەمە بێهاوتاکەی، هەر چەند بـڕێ لـە غــەزەل و قەســیدەی گوتــووە، وەلێ قــەبارەی کــەمیان لــە بەرامبــەر هەزاران دوو بەیتیەکەی نێو بۆستان و یانیش گوڵسـتان جیـاوازی زۆری هەیە.

دەکــرێ غــەزەل و قەســیدە لــە هــەر تەمەنێکــدا بگــوترێ، بــەلام دەردەکــەوێ قەســیدە و زۆرێــك لــە غەزەلــەکانی لــە نیــوەی دووەمــی تەمەنی و ئەوساڵانەی گەڕاوەتەوە شیرازێ، نوسیون.

چونکە ناونیشانی قەسیدە و ستایشکراوان و دەورانـی ژیـن و حکومـەتی ئەوکات لەگەڵ دەورانـی کـەماڵی تەمـەن و فەزیلـەتی سـەعدی هاوتایـە، لە غەزەلەکانیشیدا بەڵگە گەلێك لەو بارەوە هەیە.





لە نێو جۆرەکانی قاڵبی شێعری فارسیدا ( قەسیدە ) دەتوانرێ نێواخنەکەی لە ڕێی هۆی گوتن و زەمانەکەی چاتر پەی پێ ببرێ، بەگشتی قەسیدە لە وەسفی کەس و شوێن و ڕوداو و بارە ناخۆش و خۆشەکان، لە جێژنە و بۆنەکاندا هەڵبەستراون، دیتنەوەی زەمانی گوتنی ئاسانترە، یانیش گومانی نزیك دروست دەکات.

بەڵام لە غەزەلدا دۆزینەوەی کات و شوێن و.. دشوارە، چونکە نێوەڕۆکی غەزەل لە ناوەکەی ڕا خۆشەویستی دیارە و عیشقبازییە، ئنجا دیاری کردنی ڕۆژ و ساتی گوتن و سرودی شێعری عیشقی عیرفانیش، لە قاڵبەکانی دیکەی شێعر زۆر دشوارترە، بە تایبەت عیشقی دنیایی کە لە ساڵانی لاوی و نێوجەوانی دەست پێ دەکا و بە عیشقی مەعنەوی و عیرفانی لە دەورانی پیر و کەنەفتی بە کۆتا دێ. هەروەتر کە، وشە شاعیرانەکەی هەردوو جۆری عیشق لە شێعردا یەکسانن، ئنجا هەڵاوێرکردنی غەزەلی عاشقانی لە عیرفانی دیسان ئاسان نیە.

لە میانەی غەزەل سەراکانی شێعری فارسی، تەنێ حافیزە، کە نێوەڕۆکی ژمارە گەلێك لە غەزەلەکانی، لە هۆی گوتن و زەمان و شوێنی هەڵبەستنی ڕێنمایی توێژەرانی کردووە، ئەوەش چونکە حافیز تەنیا قاڵبی غەزەلی بۆ تەواوی باس و بابەتەکان داناوە، بێجگە لە چەند قەسیدەی دوو بەیتی و چوار خشتەکی، وەگەرنا تەواوی دیوانی حافیز غەزەلە، هەر ئەوشێوەی بۆ شێعری شاعیرانەی خۆی دەکارهێناوە. هەموو ئەو پرسانەی کە ڕەخنەی کۆمەڵایەتی و فەلسەفی و ئەخلاقی و پەند و ئامۆژگارین، دەنێو غەزەلەکانیدا جێی کردوونەتەوە، ئەوەش گۆشەیەکی ترە لە ئیعجازی کاری حافیز.



دەربڕینی بابەتێك كە باسكردنی لە قالبی غەزەلدا ناگونجێ، حافیز هێناویەتی و لە غەزەلدا ڕۆیناوە, لەبەرئەوە تەنێ غەزەلەكانی ئەوە لەبەرانبەر غەزەلی ئاشقانە و عاریفانە، بە "غەزەلی حافیزانە" نێوی دەركردووە، كە تایبەتە بە حافیز، كە نە لەپێش ئەوو نە دوایی, هیچ شاعیرێك لە جۆری غەزەلی حافیزانەی نەگوتووە.

بەلام سەعدی كە ئوستادی غەزەلی فارسیە، لە هەرجۆرێكی غەزەلدا، هەم عاشقانە و هەمیش عاریفانە, ئەو قالبەی بە ئەوجی خۆی گەیاندووە، ئەرزش و بەهای غەزەلی بەو تەرزە شێعرە بەخشیوە. هەڵبەت هەردوو جۆری عاشقانە و عاریفانەی غەزەل، عاشقانەیە، نێواخنی هەردووكیان بەیانی مەزهەری عیشق و هونەری عیشقە, نەك بابەتی ڕوداو و گرفتەكانی ژین.

بابەتی والاو تەواوی غەزەلەكانی، كەم و زۆر یەكسانە بە تەوەری عیشق و موحیبەت، باسی كەم بایەخی ژین و ڕوداو نیە, هەر بۆیە ناتوانرێ زەمان و جێی ماجەراكانیش دەستكەوێ.

غەزەلەكانی سەعدی هاوشێوەی غەزەلسەراكانی تر، پەیوەندی بە تەواوی دەوران و قۆناغی ژیانیەوە هەیە. شەور و شەوقی شاعیری و عاشقیی غەزەل خوێنی كەم وێنەی وەك سەعدی، لە قۆناغی نێوجەوانی دەست پێدەكا، هەرچی لە تەمەنی پڕ فایدە و بەرەكەتی وی دەگوزەرێ، بۆ دروستكردنی خزمەتكردنی ئەدەبیات و پەروەردە و وشەی فارسییە, بە چەشنێ تا زوبان و ئەدەبی فارسی بە بالاترین جێ دەبات، لێرەوە سەعدی لە زانست و عیشق و عیرفاندا دەگاتە ئەوجی خۆی.





سەعدی لە دەورانی نێوجەوانی بۆ بەردەوامیدان بە خوێندن بوخچێ تێکدەنێ، بەرەو بەغدا ملی ڕێی تەپ و تۆزاوی دەگرێ، تا لە گەورەترین زانکۆی ڕۆژگار، واتە نیزامیە، دەرسێ بخوێنێ، کە وەزیری نێوداری سەلجوقی خواجە نیزام الملك لە پایتەختی خیلافەت بونیادی نابوو. سەعدی هەر زوو لە نێوەندی دەورانی خوێندکاری و کۆتایی ئەو قۆناغەدا دەگاتە کەماڵ، بە چەشنێ دەرسی ئوستادان بە قوتابیان دەور دەکاتەوە و بە مامۆستای ئەوێ دیاری دەکرێت.

مرا در نظامیه ادرار بود

شب و روز تلقین و تکرار بود

دوای بڕینی قۆناغەکانی کەماڵ، دیسان لە مزگەوتی گەورەی دیمەشقێ کە یەك لە گرنگترین سەنتەری زانست و جێی گەورە پیاوانی ئەو دەمی بووە، کۆڕ و وتار پێشکەش دەکات، شێعرە عەرەبیەکانی وی لە هەرێمەکانی ئەو ناوچەدا، شاعیرانی عەرەبی سەرسام دەکا، ئەگەرچی بۆ سەعدی زمانی بێگانە بوو، بەڵام پاراو و باڵا بوو، بڕێ لە عەرەب زوبانەکان شێعری سەعدیان لە زۆر عەرەبی زمانان پێ چاتر و خۆشتر بوو.لە بارەی دەورانی منداڵی سەعدی زانیارییەکی ئەوتۆ نیە، وەلێ لە شێعرەکانیدا دەبینرێ کە ماڵباتی شیرازی بنەماڵەیەکی زانا و ئاینی بووە.

همه قبیله من عالمان دین بودند

مرا معلم عشق تو شاعری آموخت





**لە داستانێکی بۆستانێدا، یادێکی باوکی دەکات، کە لە ئەهلی خوێندەوار و شەوقی ئەو بۆ بەدەستهێنانی فەزیلەت بووە.**

**ز عهد پدر یادم آیاد همی**

**که باران رحمت بر او هر دمی**

**که در خردی ام لوح و دفتر خرید**

**ز بهرم یکی خاتم زر خرید**

**بدر کرد ناگه یکی مشتری**

**به خرمایی از دستم انگشتی**

**چو نشناسد انگشتری طفل خرد**

**به شیرینی از وی توانند برد**

**تو هم قیمت عمر نشناختی**

**که در عیش شیرین برانداختی**

**سەعدی لەو چەند بەیتەدا چوار باسی گرینگی باس کردووە:**

**أ- باوکی لە پەروەردە و فێرکردن و فەراهەمکردنی کەش و کەرەستەی فێربوون، چاوێکی تایبەتی لەسەر سەعدی بووە، لە کاتێکدا لەو ڕۆژگارەدا هەموو منداڵێك نەدەخرا بەر خوێندن، مەگین خۆیان حەزی زانستیان بووبا.**

**ب- بۆ هاندانی کوڕەکەی، دیاری گرانبەهای کڕیوە، تا لەسەر خوێندنێ گەرم و گوڕبێ و شەوقی پتر بێت.**




ت- بابەتی گرینگی سێیەم, پێویستە نێوجەوانان ئاگایان لە خۆ بێ و فریوی فریو بازان نەخۆن.

پ- دواجار تەمەنی ئێمە لە هەر گەنجینەیەك بەهادار ترە، لە زێڕ و زەنبەر ئەرزشمەنترە, قەدری تەمەن و کات نەزانین سەرمایە بە با دانە.

سەعدی دوای قۆناغی سەرەتایی دەچێتە بەغدا, لە زەمانێکدا کە سایەی باوکی بەسەرەوە نەماوە، هەروەك بۆ خۆی دەڵێ: هەر منداڵ بووم بابم کۆچی دوایی کردووە.

مـــرا باشد از درد طفلان خبر

که در طفلی از سر برفتم پدر

سەعدی لاو، بەر لە چوونە بەغدا، لە ناوەڕاستی شاری شیرازێ لە خانوچکەیەکدا دەژیا, ئەو کاتەی کە دەگەڕێتەوە، شاعیر و وتە گەوهەر و عاریفێکی کامڵە، لە خانەقای (ئەبو عبداللە بن خفیف) کە نێودارترین قوتبی عاریفانی چەرخی سێیەم و چوارەمی کۆچیە (٢٦٩-٣٧٢ ھ) ماڵێ دادەنێ, سەرباری وتە عیرفانیەکانی وی کە لە غەزەلەکانی بوستانێدا شایەدن، پەیوەندیەکی عیرفانی قوڵ و پتەوی لەگەڵ پیرانی تەریقەتدا بووە و دڵی دەگەڵ ئەهلی مەعریفەتەدا بووە. پاشان لە گوندێك لە باکوری ڕۆژهەڵاتی شیرازێ، ئارامگەی ئێستای کە تێکەڵی شار بووە، بار و بنە دادەنێ و لە خانەقاکەیدا حێگیر دەبێ, تا لە کەشێکی ڕۆح بەخش شاکارە مەزنە بێ هاوتاکەی پێشکەشی جیهان بکات.





**بەرهەمەکانی سەعدی بۆ دوو دەستە دابەش دەکرێ:**

- أ- بۆستان و گوڵستانی بێ وێنەی, کە لە دوای گەڕانەوەی بۆ شیرازێ، بە شێعر و پەخشان دایڕشتوون.
- ب- غەزەلیات و قەسیدە و شتەکانی تری، کە لە درێژایی ژینیدا نوسیویەتی و بومتە سەر مەشقی شاعیران.

گوڵستان و بۆستان هەروەك پێشتر باس کرا، مێژوودارە، سەعدی خۆی بە ڕاشکاوی باسی زەمانی نوسینی کردوون. بەلام قەسیدە و بەرهەمی تری، بە بۆنەی جیا جیا لە ڕۆژانی درێژی سارد و گەرمدا نوسراون، ئەگەر چی بالآیان لە گوڵستان و بۆستان کورت ترە, لێ لە بەرامبەر پەخشانی ئەوانیتردا بالآترە.

ئەوەی لە موتالای بەرهەمەکانی سەعدی بە درێژایی قۆناغەکانی دوای خۆی بەرچاو دەکەوێ، بێ وێنەیی سەعدییە لە فێرکاری زمان و ئەدەبیاتی فارسیدا، کە لەو ڕووە هاوتای نیە.

تێگەیشتن لە شاکاری ئەدیبان و شاعیرانی تری ئێرانی سەر و سەودای زۆری ئەدەبی و موتالای زۆری شێعریی دەوێ, بۆنمونە قەسیدەکانی ئەنوەری و خاقانی، هەروەك تێگەیشتن لە مەسنەویەکەی مەولانا پێویستە خوێنەر شارەزایی تەواوی لە وردەکاری زانستی کەلام و فەلسەفە و عیرفان و ئاساری شاعیرانی پێش وی هەبێ، وەك عەتار و سەنایی و عاریفانی وەك ابو سعید ابو الخیر، خواجە عبداللە ئەنساری، دیسان تێگەیشتن لە هەموو ئەوانەش بەبێ ئاگابوون لە زانستی ئەدەب و داب و دەستوری شێعری، ئەگونجاوە و نە لەزەت بەخشە.






بەلام وێڕای بەکارهێنانی هەموو هونەرکارییەك، بۆ تێگەیشتن لە زمان و گوتار و وتەی گەوهەرینی سەعدی، مەرجی چەند ساڵەی موتالاّ و خەرکردنەوەی زانست نیە، سوك و ئاسان تێی دەگەی. بەرهەمەکانی سەعدی لە ئەوجی وێژەو بێژەدایە، تێگەیشتن لە سەعدی نە تەنها پێویست بە پێشەکی ئەدەب و زانست نیە, هەتا خوێندەڤانی نوێ سوك و ئاسان لە زمانی سەعدی تێدەگا، هەرکەس بەئەندازەی توانای خۆی بەهرەو کەڵکی لێ هەڵدەکرێنێ.

گوڵستانی سەعدی بە قەولی خۆی کە لە دیباچەکەیدا نوسیویەتی " ئەو کتێبە ئەگەر دەکاربێت، هەم زمان ڕێك و ڕەوان دەکا, هەمیش وێژە و بێژەی نوسین جوان دەکا" لە هەمان حاڵدا هاوکاری بیر و زەینی ساحێب قەڵەم و بیرکردنەوەشی فێر دەکا.

سەعدی، ڕێنمایی تازە لاو و ساڵداریش دەکا، بە چەشنێ گوڵستانەکەی لە زەمانی خۆی و دواتریش باشترین کتێبی دەرسی فێرکاری زمان و ئەدەب، پەروەردە و ئەخلاقە، هەروەك پڕ ماناترین وێژەی پەخشانە لە ئەدەبی فارسیدا، بە جۆرێ تازە قوتابی وێڕای فێربوونی زمان و ئاشنا بوون بە وتە پاراو و سادەکانی سەعدی، زمان و ئەدەبی فارسیشی دەچێتە دڵەوە, ئەو خاڵەش لە قوتابیانی دەرەکیدا هەست پێکراوە.

هەرچی لە باسی بەرهەمەکانی سەعدیدا بگوترێ، ناگاتە پایەی ئەو هەستەی کە خوێنەران خۆیان لە ئەنجامی ڕامان لە شیرازی بۆیان دەردەکەوێ و دەیچێژن، هەر ئەوەی کە شێخی ئەجەل خۆیشی فەرمویەتی:

**مشك آن است كــه خود ببويــد**

**نـــه آنــكه عــطــار بـگـــويـد**

**میسك ئەوە كە خۆت بۆنی بكەی**

**نـــەك عــەترفرۆش پێی هەڵاَ بڵێ**

**ئێستاش بـۆ بەهرەمەنـد بـوون لـە بـاخ و بێستانی سـەعدی، چـەند نمونەیەك لە پەخشان و شێعرەكانی دێنم، تـا وە گـەردنیان بـێخین، تـا لـە بەرامـەی ناسـكی گوڵسـتانێ مەست و شـاد بـین. ڕۆحمـان فێنـك و چاوان ڕوون و نەفێن نوێ كاتەوە, پەروەردە و ڕەوشت بینـا كاتـەوە، تـا كەمێك لە ژێر سێبەری باخی تـەڕ و تێـراو و پـاراوی شـیرازێ، گـەرووی تینوو، دەمی وشك و برین، نەمامی تەمەن ئاو دەینەوە.**

**بە كەڵكی چی دێ داوێنە گـوڵێ**

**لە گوڵستانی من ببـە چەنـد چڵێ**

**گوڵ هەر پێنج شەش ڕۆژان دەمێنێ**

**گوڵستانی من دایم خـۆش دەمێنێ**



## گوڵچینێك لە باخی گوڵستانیّ

سـەعدی، شـێعر و پەخشـانی ئاوێتـەی یەكـدی كـردووە, مانـای بڵێندی جوانی پێداون، پەخشانی سەعدی لـە جۆرەكـانی ( مسجع[٧] )ە، كە پەخشانێكی ئاهەنگی و ئاوازدارە.

بەر لـە دەركـەوتنی گوڵسـتان، قـازی حمیدالـدین لەچـەرخی شەشـەمی كۆچی، پەخشانێكی ئاوازداری نوسیووە, كە لاسایی پەخشانی عەرەبیـە، بەلاّم گوڵستانی سـەعدی وایكـرد لـە زمـانی فارسـیدا هـەر بـەو كتێبـەی حەمیدی سنوردار بیّ و درێژەی نەبیّ.

سـەعدی لـە گوڵسـتاندا خولاسـە گـوتن و كـورت و پـوختی بـەو پـەڕی ئیعجاز و بڵندی گەیاند، ئەو بابەتانەی كە شاعیرانی تر سـەدان پـەڕیان پیّ گرتووە، ئاگەنە جوانی گوڵستانیّ، كـە لـە دووسـەد پـەڕدا پێشكەشـی كردووە.

داسـتانەكانی گوڵسـتان پـڕن لـە پەنـدی پـڕ حیكمـەت، بـە چەشـنیّ خوێنـەری گوڵسـتان بـیّ ئـەوەی نیـازی بیسـتنی پەنـڵدەكانی نێـو داستانەكانی بیّ، لە خوێندنـەوەی داسـتانە دڵنشینەكاندا خـاڵی گرنگـی ئەخلاقی و كۆمەلاّیەتی دەرك دەكا.

---

[٧] مسجع : پەخشانێكی ئاوازداری شێوە شیعرە. موسەجەع بە مانای ئاوازو دەنگی كۆتر هاتووە , ئاوازی كۆتریش كورت و پوخت و رێكخراوە.



توانای ئیلقای شێعریی سەعدی بە گوزارشت و دەستەواژەی کاریگەر و کورت پێشکەشکردووە، هەروەك گوڵستان پەخشانە شێعرێکی خۆش نەوا و ئاوازدارە.

ئەڵبەتە کورتی و پوختی لە پەخشاندا کاریگەری پترە، لە شیعریشدا ئەدەبیاتی کورتی یەك بەیتی و دوو بەیتیە, هۆی نێوداری چوارینەکیش بەیانکردنی بابەتێکی درێژە لە دوو بەیتدا. سەعدی لە هەردوو جۆری وشەیدا، واتا شێعر و پەخشانی ئەو تایبەتمەندییە گرنگەی هەیە و لەوپەڕی کەماڵدایە. جێ کردنەوەی بابەتێك لەیەك چوارینەدا کارێکە چوارینە هەڵبەستی بەتوانای وەك خەیام و ابو سعید ابوالخیر لە پێش سەعدی کردوویانە، بەلأم گونجاندنی داستانێك لە دوو سێ دێڕدا لە دەروازەی هیچ شاعیرێکدا نابینرێ.

سەعدی جاری وایە بە دوو بەیت شێعر، داستانێك خولاسە دەکا و دەگونجێنێ:

قضا را مـن و پیری از فاریاب

رسیدیم در خـاك مغرب به آب

مرا یك درم بـود بـرداشتند

به کشتی و درویش بگذاشتند

ئەو حیکایەتە چەند بەیتێکی بە دوادا دێ, بەلأم نەسلی داستانەکە تەنێ لە بەیتی دووەمدایە کە دەڵێ : دەگەڵ عاریفێکی پیردا گەیشتمە دەریا، درەمێکم بۆ کرێی کەشتی پێ بوو، سواری کەشتیان کردین،






عاریفی دەروێشیان سوار نەکرد، کە دروێش بە هەردوو مانا دێ، هەم عاریف و هەمیش تەنگدەست.

سەعدی مامۆستای وتە، دەزانێ کە ڕستەی کورتی پڕ مانای کەم وشە و تاك بەیتە کامڵ ماناکان، چاکتر دەچنە دڵ و دەمێننەوە، بۆیە گوڵستانەکەی بە گوزارشتی کورت و چەند بەیتی پوخت دادەنێ، تا بەیتەکان بۆ گشت فارسی زوبانانی سەرەتایی و باڵا، ئاسان بێ، لاوان فێری بنوو ببێتە چرای زانست خوازان، بە قەولی خۆی (( گوڵستانی پڕ وێژە و بێژە, قسەو نوسین تەڕ و تێر دەکات )). گوڵستان تاکە کتێبی پەخشانی فارسیە کە زۆرێك لە دەستەواژەو حیکایەتەکانی لە مەخزەنی سینەی فارسی زبانان و خەڵکی ئەدەب دۆستی دیکەشدا هەڵگراوە.

ئەزبەرکردنی شێعر فرە دژوار نییە، چونکە ئاواز و وەزنی شێعر لەگەڵ سروشتی حافیزەی ئینسان هەماهەنگە, ئەوە وا دەکات دۆستدارانی شێعر، گاهێ قەسیدە یا داستانی ڕێخراوی حەفتا هەشتا بەیتی لەبەر بکەن، کەچی لەبەرکردنی دوو دێڕی پەخشانیی گرینگی وەك کلیلە و دیمنە و مێژووی جهانگشا، قابوسنامە و نمونەی وان، ئاسان نییە و کەمتر دیومە کەسێك ڕستە و عیبارەتێکی لەو کتێبە نێودارەی لەبەر کردبێ.

وەلێ گوڵستان تاکە کتێبە، کە پەخشانەکانی بە دڵەوە دەنوسێ و دەچێتە مێشکەوە. بەدەر لە وێژەی بەرز و دڵنشینی وشەکانی سەعدی، زۆرێك لە ڕستەکانی گوڵستان لە پلە و باڵاییەکی وا دایە، کە گرینگیان تەنێ بەهۆی ڕەوانبێژی و ئاوازدارییەوەیە نیە، ئەوەش



دیسان هاوشیوەی لە ناو کتێبە گرینگەکانی تری پەخشان کەمتر دەبینرێ.

گوزارشتە کەم وێنەکان لە ناو گوڵستاندا زۆر و زەوەندن، دەستە گوڵێك بە نمونە پێشکەش دەکەین..

* درۆی مەسڵەحەت ئامێز باشترە لە ڕاستییەکی ئاژاوە هەڵایسێن.

* دە هەژار لەسەر بەڕمیەك دەنوون، دوو پادشا لە هەرێمێکدا وێك هەڵناکەن.

* هۆی براله! کاری میر و پاشایی دوو باری هەیە، هیواو ترس, واتە هومێدی نان و ترسی گیان.

* ئەوەی پەرێزی پاکە, لە لێپرسنەوەی چ باکە ؟

* لە لوقمانی حەکیمیان پرسی لە کێ فێرە ئەدەب بووی؟ وتی: لە بێ ئەدەبان.

* هەلێکی تر لێیان پرسی حیکمەت لە چی فێر بوی؟ گوتی: لە کوێران، هەتا جێیەك پێی لێ نەکوتن، پێی لێ نانێن.

* موشتاقی چاکترە لە مەلولی.

* هونەر سەرچاوەی زایندەو دەوڵتێکی پایەدارە.




لەو تـەرزە گوزارشـتانەی گوڵسـتانێ زۆرەو پەخشـانی والآی سـەعدی بـە چەشنێکە، کە ئەو وتانە بە ڕوونی دێنە بەر چاوو دڵ.
خاڵێکی تر کە لە هەموو پەخشانەکانی تـر حاڵـەتێکی (تصنع) زۆر لـە خـۆکردن، دێتـە بەرچـاوان. بـە توانـاترین نوسـەرانی پەخشـانی مەسـنوعی لـە پەخشـانەکانیاندا، تـەکلیف لـە خـۆکردن هەسـت پـێ دەکرێـت، هـەتا پەخشـانە نـا خۆڕسـکەکانیش خەسـڵەتی زۆر لـە خۆکردنیان تێدایە، لە ڕاستیدا هەم نوسەر هەمیش خوێنەر لـە نوسـین و خوێندنەوەیدا بەسەر تەکلیف لە خۆکردندا دەکەوێ.
بـەلاّم پەخشـانی سـەعدی وێـڕای ئـەوەی (موسـەجەع)ە، پەخشـانی (موسەجەع)یـش کـە لـە پەخشانی مەسـنوع هـەژمار دەکـرێ، وەلـێ لـە خوێندنەوەی پەخشانی شیرازیدا دوچاری ئەو تەکەللوفە نابێت.





## بابەتەکانی گوڵستانێ

سەعدی لە هەشت بەشدا باخچەی گوڵستانی چاندووە، دەڵێن بەهەشتێ هەشت دەرگای هەیە، سەعدیش بۆ گوڵستانێ چاوی لەو هەشت دەرگایە کردووە، بە پەیڤ و وتەی خاوێنی بە تامی بەهەشتێی چواندووە، کە لە ڕاستیدا گوڵستان بۆخۆی بەهەشتێکە. خۆ ئەگەر ئەو کتێبە بخوێنرێ و ڕێنمایی و ئامۆژگاریەکانی بە گوێ بکرێ بەهەشتێکی شیرین لەسەر ڕووی زەوی دروست دەبێ، بەهەشتی خانەوادە تا کۆمەڵگا و دواجار بەهەشتی قیامەتیش مسۆگەر دەبێ.

بەشەکانی گوڵستان تەواوی بابەتی توێژە کۆمەڵایەتیەکانی لە حوکمڕان و سوڵتانەوە تا چینی نێوەڕاست و خوارەوەی کۆمەڵگەی تێدایە، ڕووی قسەی لە دەستەیەکی تایبەت نیە.

ئەو کتێبە بەسەنگانەی کە لە بابەتە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیەکاندا نوسراون، هیچیان پێکهاتەی گوڵستانیان نیە، بۆ نمونە کتێبە نێودارەکانی قابوسنامە، سیاسەت نامە، تا ئەخلاق نامەی خواجە نەصیر، وێڕای ئەوەی کە لە داڕشتن و نێوەڕۆکدا بەرهەمێکی ئەرزشمەندن، وەلێ لە ڕوانگەی دەرەوەو ناوەوەیان، هاوشانی گوڵستانی سەعدی نین.

قابوسنامەی ئەمیر عنصر المعالی، ڕووی لە کوڕەکەیە کە دوای خۆی بگاتە کۆشکی میری و فەرمانڕەوایی. زۆرێك لە بابەت و مەبەستەکانی






قابوسنامە، دابی فەرمانڕەوایی و ئامۆژگاری و ڕێنمایی هونەری حوکومەت و مەردووم داریە، هەرچەندە بۆ تەواوی حوکمڕانان کتێبێکی بەسودە، بەڵام مەبەست و ئەصڵی نوسینەکە بۆ کوڕەکەیەتی، تاکو ببێتە جێنشینی و میرێکی سەرکەوتوو بێ.

دیسان خواجە نظام الملك، لە کتێبی "سیاسەت نامە" کە پێی گوتراوە ( سیر الملوك ) خۆی کە ماوەی سێ ساڵ گەورەی سەلجوقی بووە و کاری وەزاری کردووە، ئەو کتێبەی وەك داب و دەستوری سیاسەت و تەدبیری مەملەکەت نوسیوە، تا دەستەلاّتدارانی سەلجوقی لە کاری حکومەت و سەڵتەنەتدا سەرکەوتوو بن، کە پێویستە سەڵتەنەتی شاهانەی سەلجوقی دەوام بە وەزارەتی نظام الملك بکەن.

هەروەها کتێبی ئەخلاقی ناصر خواجە نصیرالدین طوسی، کە لە چەرخی حەوتەم و هاوزەمانی سەعدی نوسراوە، وێڕای ئەوەی کتێبێکی ئەخلاقی زۆر بەقیمەتە و لەسەر بنەمای ئەخلاقیی فەلسەفەی ئەرستۆ و فەیلەسوفانی تر، خۆیشی کە فەیلسوفێکی گەورە بووە، هەم لەسەر ئەساسی کتێبی تهذیب الاخلاق ابن مسکویە، نوسیویەتی:

مەشرەب فەلسەفیەکەی وایکردووە بە زمانێکی فەلسەفی و دشوار داپڕشتووە، کە نە تەنها بۆ ئەوانەی خوێندەوارییەکی نێوەنجییان هەیە قورسە، بەڵکە بۆ ئەوانەی ئەهلی موتالاّ و کۆڵینەوەشن ئاسان نیە، بۆیە نەبووەتە جێی پێشوازی فارسی زمانان.

زۆرینەی کتێبەکانی ئەخلاق و سیاسەتی کۆن، هەر ئەوەی کە لە پێشدا گوتم، ڕووی قسانیان لە حوکمڕانانە. بڕێ بەشی کۆڵەکەی







کتێبەکان بۆ چاکسازی کاری کەسانێکە، کە کتێبەکە بەناوی ئەوانەوە نوسراوە، یا پێشکەشی ئەوان کراوە، هەتا کتێبی ئەخلاقی ناصری خواجە، بەناوی ناصرالدین قهستان، نێودێر کراوە.

بەلاّم گولستان کتێبێك نیە بۆ میری یا بە ناوی یەکێ نوسرابێ، لە پێشەکی گولستانێدا دەبینین شەوقی سەعدی لە دانانی گولستان کاریگەری یەکێ لە دۆستی ئەدەب دۆستی خۆیەتی، ئەوکاتەی سەعدی گۆشەگیری و بێدەنگی هەلّبژاردووە، بە تکاو ڕەجای زۆر دەیەوێ وە قسە بێتەوە و بدوێ و بنوسێ. "پێچەوانەی ڕێی ڕەوان و ناقلّمەندانە زولفەقاری عەلی دە کالأندا بێ و زمانی سەعدیش زیندان کرابێ.

سەعدی تەنها یەك بەشی گولستانی بۆ ئاکارو ڕەوشتی پاشایان تەرخانکردووە، تێیدا ئامۆژگاریی چۆن هەستان و ڕاپەڕاندنی کاری خەلّکی دەکات، خەمیان هەر مانەوەی خۆیان نەبێ.

لە بەشەکانی تر چینەکانی تری کۆمەلّگای هێناوە، لە جەوانێکەوە تا پیرە مێردێ, لە دەولّەمەندێ تا باخەلّ بەتالێ, لە تواناداری تا بێدەست و بندەستێ.

سەعدی، واقیعی ژیان شەن و کەو دەکات، جحێلاّن لە چاکەو خراوە وشیار دەکا، لە باسی عیشق و جەوانی، ئەگەر چی هەندێ تانەیان تێکرتووە، لێ ئەو باسە بۆ ڕێنوێنی و وشیاری لاوانە، نەك هەلّداشتن و لادانیان.

سەعدی بەمەبەستی هۆشیاری خوێنەرانی کەم ئاگا واقیعی ژین ورد و وەرد دەکاتەوە، هیچ کات خراپ فێرکاری ناکا و مەبەستیشی نیە، لە حالێکدا لە هێندێ کتێبدا کە ناوی کتێوی ئەخلاقیشیان لێنراوە، بە وێنەی قابوس نامە، باسێکی تایبەت لە ئارەق خۆری هەلّگرتووە.




هەشت بابەکەی گوڵستانێ، کە تەواوی باس و خواسی ژیانە و دروستکردنی ئینسان و کۆمەڵگایەکی کامڵ و ئەخلاقیە، ڕیزبەندیەکەیان بەو شێوەیە:

بابی یەکەم : باسی ڕەوشتی میرو شایان

بابی دووەم : باسی ڕەوشتی هەژاران

بابی سێیەم : باسی فەزیلەتی قەناعەت

بابی چوارەم : باسی فایدەی بێدەنگی

بابی پێنجەم : باسی عیشق و جحێڵی

بابی شەشەم : باسی لاوازی و پیری

بابی حەوتەم : باسی کاریگەری پەروەردە

بابی هەشتەم : باسی گفتوگۆو نەریتی قسە

سەعدی لەتەواوی بەشەکاندا بێجگە لە بابی هەشتەم، دەستور و ڕێنماییە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیەکان لە شێوەی حیکایەت دێنێ، کە جێی پەسەندی سروشتی ئینسانە. هەروەك هونەری نمایش و نمایشنامە و فیلم و سینەما، لەسەر ئەو شێوە و بنچینە دارێژاون. چونکە زمانی داستان کاریگەری لە ڕستەی فەرمانی ئەخلاقی پترە، بڕێ جار سروشتی سەرکەشی نێوجەوان لە جێی ئەوەی پەند و حیکمەتی فەرمانی قبوڵ بکات، لێ کاردانەوەی پێچەوانە نیشان دەدا.
سەعدی دەیەوێ تەواوی ئامۆژگاری و واقیعی تەمەنێکی تولانی لە جحێڵی تا پیری لە کتێبێکی سنورداری کەم حەجم کە گوڵستانە، ڕۆبنێ.



چیرۆکەکان کورت و پوخت دادەنێ، تا هەموو کەسی حەوسەلەدار و بێ حەوسەلە، لە کەمترین ماوە و چەند دێڕێکدا داستانەکە بخوێنێتەوە و بە ئەنجام بگات، هەمیش لە کتێبێکی کەم حەجمی ئاوا دا هەموو مەبەست و کێشەکانی ژیانی تێدا باسبکات.

زۆرێك لە ڕێنیشاندەرانی ئەخلاق تەنێ لاوان دەدوێنن و ئامۆژگاری دەکەن، چونکە پتر چاوەڕێ دەکرێ گەنجانی کەم ئەزموون، هەڵە بکەن، بەڵام مرۆڤ بە گشتی هەڵە دەکا و لێشی چاوەڕێ دەکرێ، هەڵەکاری و هەڵە تەنیا بە دەورانی جحێڵی پەیوەست نیە, سەعدی لەسەر ئەو بنەوایە ئامۆژگاری پیر و بەساڵاچوانیش دەکات:

چون پیر شدی ز کودکی دست بدار
بازی و ظرافت بە جوانان بگذار

تۆ کە پیر بووی دەست بەردە لە کاری منداڵان
یاری و تیف تیفە واز لێبێنە بۆ لاوان

ئەو شێوە ئامۆژگارییە لە بەشی شەشەمی گوڵستانێدا زۆرە، هەروەك لە بوستانێشدا هەیە. دوپاتکردنەوەی ئامۆژگاری پیران بابەتێکە کەمتر لە بەرهەمەکانی سەعدی هەڵوەستە و توێژینەوەی لەسەر کراوە، سەعدی کە خۆی گەیوەتە پیری و تەواوی حاڵەتەکانی ژین و خەڵکی لە هەژار و دەوڵەمەند لە ئاقڵمەندێك تا کرێکاری بەستەزمانی لە بەرچاو بووە. گوتار و وتە و یاسا ئەخلاقیەکانی، وشك و بڕێن نین، بەچەشنێ کە تەنیا لەسەر کتێبێ بخوێنرێتەوە و ئەزموون نەکرێ.






سەعدی هەرچی گوتووە ئەزمونی کەسیی خۆی پشتیوانی قسەکانیەتی. پاشان ئامۆژگاری کردنی پیران وایکردووە قسەکانی سەعدی کاریگەری زۆرتر بخاتە سەر جحێڵان, لە لایەکی تریشەوە سەعدی بە تەنیا بەدوای گەنجانەوە ناگەڕێت، بە نەزان و کاڵفام ئەژمارییان ناکا، کە کاردانەوەرو پێچەوانە نیشان بدەن، بەڵکو هەر کەس هەڵە و کاری بەد بکا، چ گەنج یا پیر، بە ناڕەوا و هەڵە دەیبینێ و ئەو خاڵەش دیسان کاریگەری گوفتاری وی زێتر دەکات.







## لەمەڕ چیرۆك و بەشەكانی گوڵستانێ

بەر لەوەی بە هەشت دەرگاكەی گوڵستانێدا بچینە نێو داستانە گرینگەكان و شرۆڤەیان بكەین، پێویستە گرینگی دیباچەكەی گوڵستانێ لەبەرچاو بگرین، خۆ ئەگەر سیفەتی ( خارق العادە )ی بۆ بەكار بێنم زێدەڕەویم نەكردووە.

هەر نوسەرێك بۆ كتێبەكەی خۆی پێشەكیەك دەنوسێ و خاڵە گرینگ و هۆی دانان یا وەرگێڕان باسدەكا. لە پشتی نوسین و چاپی كتێبیش، چەند فاكتەرێك هەیە، وەكو گەیاندنی مەعریفە بە خەڵكی و هۆشیاری كۆمەڵگە, هەستی ناو و نێوبانگ, بڕێ جاریش ڕاو سەرنجی ئەوانیتر هۆی لە دایكبوونی بەرهەمێك یا چەند بەرهەمێكە.

بەڵام سەعدی پێچەوانەی زۆرێك لە گەورە شاعیران و ئەدیبان، دوای گەڕانەوە لە سەیر و سەفەری دونیای ئەوكات و هۆنینەوەی چریكە شێعرە بێهاوتاكانی غەزەل و قەسیدەكانی، وە نوسینی بوستان لە ساڵی ٦٥٥ ك، ئنجا بڕیاری گۆشە نشینی دەدا، وەك ئاماژەم پێدا، كاتێ دەشگەڕێتەوە ناچێتە خانوچكە و كاشانەی پێشووی، لە دەرەوەی شیرازێ خانەقایەك دروست دەكا و قوژبنی گۆشەگیری هەڵدەبژێرێ.




وێـڕای بەڵگـەکان، دیباچـەی گوڵسـتان خـۆرێکی پرشـنگداری غـەزەل و قەسیدەی ئاسمانی ئەدەبیە، کە یەك لە شانازی مەزنی شاعیرانەیە.

لە دیباچەدا فەرموویەتی ".. وام بە چاکزانی لـە کونجێکـدا گۆشـەگیری هەڵبـژێرم و داوێنـی قسـان هەڵکێشـم و دەفتـەرێ لـە قسـەی پەرێشـان دەراوێژم و چیدی قسەی پەرشو بڵاو نەبێژم..

ئەو قسانە خۆ ئاساندن نیە، بەڵکو سەعدی گەیوەتـە پـیری و دوای ئـەو هەموو گەشت و گەڕان و ڕوانـین لـە بڵنـدایی و نـەفس و نـەوی، کە بـە هۆیـەوە جیهانبینیـەکی بـێ وێنـەی بـۆ خوڵقـابوو، ئنجـا بڕیـار دەدا ئەوەندەی لەتەمەنی ماوە، گۆشەنشین دانیشێ و لـە چـەقە چـەقی دنیـا کـەنارگیر بـێ، بکەوێتـە ورد بوونـەوە لـە جیهـانی فراوانـی دەروون و گەردوون..

سـەعدی، دوای ئـەو میراتـە مەزنـەی جێـی هێشـتووە، نێـوی بـە چـاکی دەڕوا و کەوتۆتـە سـەر زاری هـەمووان، وتـە و وتـاری شـیرنی لـە پانـایی زەویـێ بـڵاوەی کـردووە و قامیشـی شـەکریی وتـەکانی وەك قەنـد دەخورێ، وەك زێڕ و گەوهەر وتە و وتارەکانی دەکڕن..

سەعدی بەر لە دانانی گوڵستانێش، بە قسەی خـۆی، نێـو و نێوبـانگێکی ناوەکی و دەرەکی پەیدا کردبوو.

هفت کـشـور نـمـی کنند امـروز
بـی مقـالات سعـدی انجمنی

ئـەمڕۆ حەوت کیشوەر بێ وتارەکـانی سەعدی
خڕ نـابنەوە و سـاز نـاکەن کۆڕ و مەجلیسێ



خۆ ئەگەر سەعدی گوڵستانیلاشی نە نوسیبا، مەقامی بەرزی لە زمان و ئەدەبیاتی فارسیدا هەر ئەوە دەبوو کە ئێستا هەیەتی، دانانی گوڵستانیش لە پەخشانی فارسیدا پلەی یەکەمی گرتووە، کە هیچ شاعیرێك ئەو پێگەیەی لە پەخشانی فارسیدا بە دەست نەهێناوە.

پێویستە وێڕای ڕەحمەت ناردن بۆ گیانی سەعدی، دۆستەکەشی لە بیر نەکەین، کە لە شکاندنی پەیمان و بەڵێنی سکوتەکەی سەعدیدا ڕۆڵی بووەو پێی گوتووە: ڕەنجاندنی دۆستان نەزانینەو کەفارەتی سوێندێش ئاسانە".

ئەو، سەعدی مەزنی بۆ نوسینی کتێبێك وەجوڵە خستووە و مەیلی پێداوە، کە لە مێژووی هەزار ساڵەی ئەدەبی فارسیدا، پەخشانێکی لەم وێنەیە نیەو فارسی خوێنان لە دەورانی سەعدیڕا تا وێستا چەپکە گوڵی زمان و ئەدەبی فارسی لێ دەچنن.

دیباچەی سەعدی پێویستە زێڕا و بکرێ و بناغەیەکی مەزنی دروستکاری ئینسانی کامڵ و مەعنەوییە، ئەگەر تەنێ دیباچەکەی وەربگرێ و فەهم بکرێ، بەسە.

"... دیباچەی گوڵستانێ ئەو گەوهەرە بە قیمەتیە کە لە ڕاستیدا نە تەنێ بۆ دەورانی ژینی سەعدی و حەوسەت ساڵی دوای سەعدی کورت هەلاتووە، بەلکو بۆ سەردەمی خۆی و دوای خۆی و تا کۆتایی بەشەریەت ئەو دەستورە ئینسانی و ئەخلاقی و ئیمانیەیە بۆ تەواوی دەستە و چین و تەمەنەکان هەمیشە تازە و بەهاریی و باقییە، هەرگیز فەسڵی خەزانی نیە، دوای تێپەڕینی چەندان دەور و زەمان و ئاڵو گۆڕی دونیا و بەشەریەت، وەلێ سەعدی هێشتا باقییە و هەروەکو تازە خۆی و گوڵستانی لەدایك بوبێ و بەهاری هەوەڵێی بێ، گوڵستان



زیندوو بەخشەری گیان و تازەگی و ژیانە، گوڵستان هەمیشە گوڵستانە، بە چەشنێ سەعدی خۆیشی درکی دایم گوڵستانی و بەهاری گوڵستانی کردوە و باسی کردووە " گوڵستانی من هەمیشە گەش و تەڕ و تازەیە" گوڵستان و بۆستان دوو کتێبی ئەخلاقی ئەدەبین ڕیشەیەکی قورئانیان هەیە..

ئێمە لەو دۆخەی زانستی و تەکنەلۆجیەدا چ پێویستیەکمان بە سەعدی هەیە؟ لە ڕاستیدا فرە بۆی زەرورین، چونکە تەکنەلۆجیا و زانستەکان ناتوانن ئینسانێکی ئەخلاقی بونیاد بنێن، ئینسانێکی ڕۆبۆتی دروست دەکەن، هەرگیز ناتوانێ ئەخلاق حەل بکات، ناتوانێ ببێتە مامۆستای ئەخلاق..

ئەخلاقی سەعدی ئەخلاقی ئیلاهیە، تەفسیری ئەخلاقیی قورئانیە، ڕیشەی ئەخلاقیش ئەقڵ و ئاینە، نە شتێکی تر، " تخلقوا باخلاق الله " ڕیشەی ئەخلاق لە خودا و ئەقڵە، ئاین کە بەرنامەی و وەحیی ئیلاهیی ڕاستەخۆیە و ئەقڵیش گەورەترین نیشانەی خوداوەندە، هیچ شتێك لە ئەندێشە لە خوداوەند نزیك نیە..[٨].

بۆیە هەر لە دەستپێکی گوڵستان و بۆستانیشدا بە سوپاسگوزاری هەق تەعالا دەست پێدەکات، دڵ و گیانی بە شوکرانە و وشەی پڕ لە ئیمانی و جوان تێرا و دەکات، شێعر و بەستەی دڵاوێزی پێشکەش دەکات..

" ستایش و گەورەیی بۆ خودایەك كە تاعەتکردنی هۆی لێ نزیك بوونەوەیە، سوپاسگوزاریی وی مایەی زێدە بوونی نیعمەتە.

---

[٨] . د: غولام حوسێن دینانی _ بەرنامەی مەعریفەت_ شەرحی دیباچە. وەرگێڕ



هەر هەناسەیەك دێتە دەرێ درێژ بوونەوەو نوێ كردنەوەی ژینە، هەر هەناسەیەكیش دێتەوە ئاسودەیی گیانە. كەوابێ لە سەر هەر هەناسەیەك دوو نیعمەت هەیەو بۆ هەر نیعمەتێكیش شوكرێك واجبە".

بە دەست و زمانی كێ
شوكرانەی خودا دێتە جێ

" اعْمَلُوا آلَ دَاوُودَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ "

واتا: ئەی ماڵ و خێزانی داود شوكرێ بكەن، لە عەبدەكانم كەمترینیان شوكرێ دەكەن.

بندە همان بە كە ز تقصیر خویش
عذر بە درگاه خدای آورد
ورنە سزاوار خداوندیش
كس نتواند كە بە جای آورد

واچاكە بەندە لەبەر كەمتەرخەمی خۆی
عوزر خوای بباتە بەر دەرگای خودای
خۆ نەگەرنا شیاوی خوداوەندی
كێ دەتوانێ بەجێ بێنێ بەندایەتی






بارانی بێ شوماری ڕەحمەتی بە هەموو شوێنێك گەیشتووە، خوان و سفرەی پان و بەرینی پڕ نیعمەتی لە هەموو جێیەك ڕاخراوە، پەردەی شەرم و ئابڕووی بەندەکانی بە گوناح و تاوان نادڕێ، ڕۆزی و موچەی بەندەکانیشی بە سوچ و هەڵە نابڕێ.

ای کریمی کـــه از خـــــــزانەی غیب
گبرو ترســــــا وظـــــــیفه خـــور داری
دوستـــــــــان را کــــــجا کنی مـحروم
تو کــــــــه بـــــــا دشمن این نظر داری

ئەی خودای کەریم لـــــه گەنجینەی شاراوەت
لــه گـــاور و جــــوو مووچــه خۆرت هەیە
کـــوا بــێ بــەش دەکـــــەی دۆستەکـــانت
تــۆ کــه لەگــەڵ دوشمندا چـاکـەت هـەیـە

ابرو باد و مــــه و خورشیــد و فلك در کارند
تا تو نانی به کف آری و بــــــه غفلت نخوری
همــه از بهر تـــو ســــــرگشته و فرمـانبردار
شرط انصـــاف نبـــاشد کــه تو فرمان نبری



**هەور و با و مانگ و ڕۆژو گەردوون لە خولدایە**
**تاکو تۆ نانێك پەیدا بکەی و بە غافڵی نەیخۆی**

**بۆ تۆ وا دێن و دەچن و فەرمن بەجێ دێنن**
**بێ ویژدانیە کە تۆ فەرمان بە جێ نەیەنی**

**کـــرم بیـــن و لـــطف خـداونـدگار**
**گناه بنـــــده کـــردەست و او شـرمسار**

**لوتف و کەرەمی خـــوداوەندگار ببینە**
**بەندە گوناحان دەکـــا و ئەو شـەرمێ دەکا**

**جوانترین دەرسی عیشق و مەعنەویەت و عیرفانی لەو دێڕە شێعرەی پڕ سۆز و کوڵی ئەویندارى دیباچەدا خۆی دەبینێتەوە، بەندەگی و دۆستایەتی حەزرەتی هەق تەعالا، شەو بێداران و دۆست خەبەرداران بێ نرکە و ناڵەن، بێ هات و هاوار و بێ ڕیا و مەست و پەروانە ئاسا پەرو باڵ سوتاون لە شەور و شەوقی بەندەگیدا..**

**ای مرغ سحر عشـــق ز پـــــروانە بیاموز**
**کآن سوخته را جـــان شـــد و آواز نیـامد**

**ئەی مورغی سەحـــەر عیشق فێربە لە پەروانە**
**سوتا، گیانی سپارد و لێی نـــەهات نرکە و ناڵە**

وصــــف ترا گـر کـنـند ور نـکـنـند اهـل فضل
حــاجـــــــت مشـــاطه نیسـت روی دلـارام را

ئەهـــلی چـــاکـه وەسفــــت بکـەن یـــا نـە
ڕووی دلأرام پێویستـی نیه بـە ئـارایش و شانــە

**نه هەرچی بە بالاّ بلّیندتر بە قیمەت پتر**

یـەکێ لـە چـیرۆکەکانی هـەوەڵی بەشـی یەکـەمی گوڵستـانێ، باسـی شازادەیەکە، کە لە ڕووی ئەندام و بالاّ لـە براکانی کـورت و بـە ڕواڵەت لاواز ترە, وەلێ لە ڕووی هێزی دەروونی قەوی تـر " بیستم شـازادەیەك کورتـە بـالاّ و بەسـتەزمان بـوو، براکانیشـی بـەرز و تـەرز و بەرچـاو بوون. ڕۆژێکیان بابی بە چاوێکی سووك و چووك لێـی ڕوانـی، کوڕەی کورتیلـە بـە تیـژ بینـی خـۆی تێگەیشت و بـە ڕوویـدا هەڵدا و گـوتی : کورتیلەیەکی ئاقڵمەند چاکترە لە درێـژێکی گێـژ، وە نـەبێ هەرچی بـە بـەژن بـالأتر، لێهاتوو کارامـە تـر.. زۆری بەسـەردا تێنەپـەڕی، دوژمـن هێرشـی هێنـا , یەکـەم کـەس کـە چـووە مەیـدانێ و دەگـەڵ دوژمـن دەسـتە و یەخـە بـوو، ئـەو کـوڕە چـوکەڵە بـوو، چـەندین ئەسپسـواری دوژمنی فڕێدانە خوارێ.

اسـب لاغــــر میـــان بــــه کـار آید
روز میدان نه گـــــــا و پـــــرواری



**ئەوەی لە جەنگەی شەڕدا پێویستە**
**ئــــەسپی تـانجیە نەك گای دابەستە**

دوای ئــەو ڕوداوە، کورتیلــە بــووە مایــەی چــاولێکردن و بەهەنــد لێڕوانینی، باوکی کردیـە جێنشینی خـۆی. براکانی ویستیان لـە نێـوی بەرن، خواردنی ژەهرداریان لەپێش دانا، بەڵام خوشـکەکەی دیتـی و بـە تەقـەی دەرگـا ئامــاژەی دا و ئاگــاداری کــردەوە، شــازادە دەســتی لــە خواردنێ کێشایەوە و گوتی: نابێ هونەرمەند بمـرێ و بـێ هونـەر جێـی بگرێ.

کس نیاید به زیر ســــــــــایه بـوم
ور همای از جهــــــــــان شـود معدوم

ئـەگـەر ئـاســەواری هــوما[٩] نــــەمێنێ
کـەس پەنا بۆ سێبەری کوندە پەپو نایەنێ



[٩]. هوما : باڵندەیەکی ئەفسانەییە بە باوەڕی قەدیمیان ئەگەر سێبەر بکاتە سەر کەسێك خۆشبەخت و ڕوو بە بەخت دەبێت ــــ وەرگێڕ







**لە هەیوانی کۆشکی فەرەیدون نوسرابوو:**

**جهـان ای بـــرادر نمـانـد بـه کـس**
**دل انـدر جهـــان آفـــرین بنـد و بس**

**گەلۆ، جیهان تاسەر نەمـــاوە بـــۆ کـەس**
**دڵ بە ئـافرێنەری جیهان ببەندە و بـەس**






## بەشی یەکەم: ڕەوشتی پاشایان

سەعدی بەشی یەکەمی باخی گوڵستانەکەی بە چل و یەك داستانی پڕ لە پەند و ئامۆژگاری گوڵدار چاندووە، ئێمەش لە هەر دێراوێك چەند چڵێك دەچنین.

### درۆیەکی ڕوو لە خێر چاترە لە ڕاستیەکی سەر بە شەڕ

پادشایەك بۆ کوشتنی دیلێك ئاماژەی دا، بێچارە لە حاڵی ناهومێدی دا جنێوی بە پاشادا دا و قسەی ناشیرنی گوت، گوتراوە: هەرکەس دەست لە گیان هەڵگرێ، ئەوی دە دڵیدایە دەریدەبڕێ.

پاشا پرسی چی دەڵێ؟

یەك لە وەزیرانی دڵپاکی شا گوتی: جەنابی میر هەر دەڵێ " والکاظمین الغیظ و العافین عن الناس " ١٢٩. ئالی عیمران.

پاشا ڕەحمی بە دڵدا هات و سەرفی نەزەری کرد.

وەزیرێکی تر کە دژی ئەو بوو گوتی: ناکرێ ئێمە بەرانبەری شا بێجگە لە ڕاستی بڵێین، قوربان ئەو کابرایە جنێوی دا و قسەی خراپی گوت"

پاشا نێوچاوانی لەو قسەیە تێکنا و گوتی: درۆی ئەوم لە ڕاستیەکەی تۆ لا خۆشتر بوو، چونکە ڕووی ئەو لە خێرێکدا بوو و ئەوەی تۆ ڕوو لە شەڕە. زانایان گوتویانە: درۆیەکی ڕوو لە خێر باشترە لە ڕاستیەکی سەر بە شەڕ.

شا دەگەڵ هەر کەس بکا ڕاوێژێ<br>
حەیفە ئەو جگە لە چاکە بێژێ






## سەرکۆنەی ستەم و ستەمکاران

سەعدی لە بابی یەکەمدا ئامۆژگاری پاشایان دەکات، کە چلۆن ئاکار و ڕەوشێك لەبەرچاو بگرن، ئاگایان لەستەم و ستەمکاری بێ.

دەربارەی حەجاجی یوسف کە لە زەمانی ئومەوییان و لە لایەن عبدالملیکی کوڕی مەڕوان کرابووە حوکومەتداری حیجاز و عێراق، کە ناو و کاری وی نمونەی گەورەی ستەمگەرییە، عبدالله ی کوڕی زبێر بە هۆی ئەو دێتە کوشتن. سەعدی هەم لە بوستان و هەمیش لە گوڵستانێدا باسێك لەم و ستەمەکەی دەکا و سەرکۆنەی دەکات، تا ببێتە پەند بۆ ئەوانی دی و دەست بۆ ستەمکاری نەبەن.

"دروێشێکی دووعا قبوڵ لە بەغدا پەیدا بوو، خەبەریان دایە حەجاجی یوسف، بانگی کرد و گوتی " دوعایەکی بەخێرم بۆ بکە" ئەویش گوتی : خوایە گیانی بستێنە. حەجاج وتی : بۆ خاتری خودا ئەوە چ دوعایەکە ؟ وتی : دوعایەکی خێرە بۆ تۆ و موسڵمانانیش.

ئەی زەبر بە دەست، ژێر دەست تــــــاکەی گەرم بمێنێ بە ئازار
بەکەڵکی چی دێ دنیاداری، مردنت چاکترە نە خەڵکی بدەی ئازار

## دانیشتن چاکترە لە سەرقاڵی پلە و پایە

سەعدی وێڕای ئامۆژگاری دەست ڕۆیشتوان و هاندانیان بۆ چاکەکاری، لە هەمانکاتدا لە ناپایەداری دونیاو کاروباری، هۆشداری دەدات. ئامۆژگاری ئەرکانی حوکومەت و دەوڵەت دەك ا، هیچ کات دڵبەندی دەگەڵ پلەو دەستەلاتدا نەکەن. چون هەموو پایەو تەواوی کاروباری دونیاو ژینی، ڕۆژێ دێ بە کۆتا بێ و ئەوەشی دڵداری جیهان بکا، ئەو وەختەی لە دەستی دەدا حەیف و حەسرەت نەبێ چیتری پێ

نـابڕیٚ. وەزیرێـك لەسـەر كـار لابـرا, ڕووی لـە حەڵقـەی قەلەنـدەرو دەروێشان نا، بەرەكەتی هاودەمی ئـەوان كاری تێكرد, ئەوەی دە دڵیـدا بـوو، ڕۆیشـت. پاشـا دڵـی پێخـۆش بوویـەوە، بـانگی كـرد كـاری پـێ بسـپێرێتەوە, قـەبوڵی نـەكردو گـوتی: تـاریكی و قەلەنـدەری لـە لای ئاقڵمەنـدان باشـترە لـە دەسـتەڵاتی گـران. پاشـا گـوتی: مـادام وایـە ئاقڵمەنـدێكم بـۆ دەستنیشـان بكـە كاروبـاری وڵات بەڕێوەبـەرێ، گـوتی: جـەنابی پاشـا، ئاقڵمەنـد ئەوەیـە گیـان و سـەری خـۆی دەو كارانـە وەرنەدا.

**بناغەی ستەم لە سەرەتادا كەم بووە**

" دەگێڕنـەوە ئەوشـیروانی عـادڵ لـە ڕاوگەیـەك نێچیرێكیان ڕاو كـرد، كردیانە كـەباب, خوێیـان پـێ نـەبوو، بـۆ خـوێ پەیـداكردنێ پیاوێكیـان ناردە دێیـەك، ئەوشـیروان گـوتی: خـوێ بـە قیمـەت بسـتێنە نـەك بـە قـەوەت، تـا نەبێتـە داب و ئـاوەدانی خـراپ نـەبێ. گوتیـان قوربـان بـە مسـتە خوێیـەك چ خراپەكارییـەك ڕوودەدا؟ گـوتی: بناغـەی خراپـە لەسـەرەتادا كـەم بـووە، هـەر كـەس هـات و شـتێكی لـێ زیـاد كـرد، تـا گەیشتە ئەو ڕادەیە.

ئەگەر پاشا لە باخی خەڵكی سێوێك بخوا
ڕەشوو ڕوت لە بنی دەردێنێن باخی كابرا
سوڵتان پێنج هێلكە بە سـتـەم ڕەوا ببینێ
سەپان هەزارەها مریشك بە شیشەوە دەنێ






**نابێ بە مەرگی دوژمن شاد بین**

یەکێ: مزدەی بۆ نەوشیروان هێنا و گوتی: خودای گەورە فلان دوژمنەی بۆ لای خۆی بردەوە، لە وەلامدا پێی گوت: ئەی هیچ هەواڵی ئەوەت پێیە وازی لە ئێمە هێنابێت ؟

اگر بمرد عدو جای شادمانی نیست
که زندگانی ما نیز جاودانی نیست

ئەگەر دوشمن بمرێ، جێی شادی نیە
خۆ ژینی ئێمە لە چاو وی جاویدانی نیە

جهان ای برادر نماند به کس
دل اندر جهان آفرین بند و بس

مکن تکیه بر ملک دنیا و پشت
که بسیار کس چون تو پرورد و کشت

چو آهنط رفتن کند جان پاك
چه بر تخت مردن چه بر روی خاك

هۆی براله دنیا نەماوە بۆ کەس
تەنێ دڵ بدە بە ئافرێنەر و بەس

**********

ئـەکـەی بە مـوڵـکی دنیـا مـەبـەستـە پشت
زۆر کـەسی وەك تـۆی پـەروەردە کرد و کوشت

کـە گیـانی پـاك زەنگـی ڕۆیشتنی لێدا
وەکو یەکە بمری لە سەر خاك یانە لە سەر تەخت

************

پیـاوی خـودا ئـەگـەر نیوە نانێك بخوا
نیـوەکـەی تـری دەداتـە بێ نـەوا

دە قەلەندەر لەسەر بەڕەیـەك هـەڵدەکەن
بەڵام دوو پاشا لە هەرێمێکدا وێك هەڵناکـەن

ئینسانەکـان ئـەنـدامی لـەشی یـەکتـرن
لە خـوڵقـاندنێدا لـە یـەك گـەوهـەرن

کە ئـازاری ئـەنـدامێك بـدات ڕۆژگـار
بـەشـەکانی تـری لـەش دەبـن بێ قـەرار

ئـەگەر تـۆ لـە دەردی خـەڵکی بێ خـەمی
نـاشـێ نـاوت بنـرێ ئـادەمـی



قــارِوون فـــــــەوتـــا بە چل گـــەنجینەوە
نــەوشیروان مـــــــــا، بـــە نێو بـــانگەوە

هـــــــەتـــــا دەتـوانی کـەس مـەرەنجێنە
کــە پڕ لـە درکـــــــە ئـــەم ڕێگا و بـانە

دەســـــتـی قـــەلـەنـــــدەری بێ ئەنوا بگـرە
تـــاوەکـو دەستـــت بـگرن ڕۆژی تـەنگـــانە

******

چــــــەند دەستە گـوڵێکی تـازەم دی
گومبەزێك لەگەڵ گیا دەستە ملانی یەکدی
گوتم گیایکی ناچیز ئـاخـر چـۆن دەبێ
دەگـەڵ گــولانـدا لـە ڕیــزێ دانیشێ
گــریا گیـــا و گـوتی بــێ دەنـگ بـــە
فەرامۆش نـاکا خۆشـەویستی هـاورێیەتی
گــــــەرچی نیـمە جـەمـاڵ و ڕەنگ و بۆ
بـــەلام لــە گیـای بــاخی ئــەوم، خۆ

" لە بابی دووەم"



## بەشی دووەم: ڕەوشتی قەلەندەران

داستانەکانی ئەو بەشە لەسەر بناغەی ڕەفتاری پەرهیزکاران و پاکان هەڵچنراوە، کە حورمەت و شکۆی ئینسانی لە سەرووی هەموو شتێك دادەنێن، لەو جێگایەی پێگەی مرۆڤ دەکەوێتە لێژی و دارمان، لە هەموو شتێکی تری ژیان، چاوان وەردەگێڕن.

بەباوەڕی سەعدی، قەلەندەریی و زوهد، تەرکی دونیا نیە، بەڵکو خۆپاراستن و پەرهێزکارییە لە کاری نەشیاو و نا قۆلاً.

لە چیرۆکی بەشی دووەمدا سەعدی خوێنەران بۆ ڕێ و شوێنی پاك ویستی و جوانی دڵ و خەسڵەت و ڕەفتار چاکی، ڕا دەکێشێ، کارە ناپەسەندەکانیش بە وێنە دێنێتەوە، تا زووتر کاریگەری بێ و ئامۆژگاریەکان بە دڵەوە بنیشێ.

### چەند نمونەیەك لە داستانەکانی بەشی دووەم

شێخ عەبدولقادری گەیلانیان بینی لە حەرەمی کەعبە ڕووی خستبووە سەر خاك و خۆڵ و بەردوچکەکانی کابە و دەیگوت: خودایە بمبەخشە و ئەگەر شیاوی سزادانیشم لە ڕژی قیامەتێ بە کوێری هەڵمستێنەوە تاوەکو شەرمەزاری ڕووی پیاوچاکان نەبم.

" یەکێ لە مەزنان بە خواناسێکی گوت: لە بارەی فلان خواپەرست چ دەڵێی، کە خەڵکی تر تانەی تێدەگرن و بە سەرکۆنەوە قسەی لێ دەکەن؟ گوتی: لە ڕواڵەتیدا هیچ نەنگی نابینم، بۆ ناخیش نهێنی و غەیب زان نیم.





**بەرگی خوداپەرستیت دەبەر هەر کەسێکدا دی**

**بە چاك و خواپەرستی ببینە**

**ئەگەر نەزانی لەناوەوەیدا چی هەیە**

**لە دیوی دەروون چ کارت پێیە؟**

**لەو چیرۆکەدا کە لە سەرەتای بەشی دووەمی گوڵستانێدا هاتووە , سەعدی یاسایەکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی گرینگی نیشان داوە، کە پێویستە ئینسان لە ڕوانین و دینی خەڵکی خۆش بین بێ, نەك بەد گومان.**

**لە نێو هەر گەل و جۆری ئینسانەکاندا خەڵکی نەشیاو هەیە, بەڵام نادروستی کەسێك، نابێ ببێتە هۆی ئەوە هەموو خەڵکی هاوشێوەی خراپ نیشان بدرێن. دروستی و چاکی پێوەری ئەخلاقە، مەگەر مرۆڤ خۆی کاری نادروست بکا و بە ئاشکرا ببینرێ. گومان بردنی خراپ بە ئەوانی دی دەبێتە هۆی لە نێوبردنی گومانی چاك و نیەتچاکی لە کۆمەڵگەدا، ئەگەر هەموان بەد بین بن، ئولفەت و داد و خۆشەویستی کە شیرازەی کۆمەڵگەیە، نامێنێ.**

**سەعدی لەو چیرۆکەدا مەبەستیەتی کۆڵینەوە لە هەڵە و کەم و کەسەری ئەوانی تر نەگرێت, بەدوای عەیبەی خەڵکی نەگەڕێین، چ کارت بە دەرونخانەی ئەوانی ترە؟ دەکرێ بڵێین ئامۆژگاری ئەو چیرۆکە مەرجی یەکەمی پێکەوەژین و جوان ژینی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە.**



**قەلەندەرێکم ڕوو لە ڕەحمەت**

**" قەلەندەرێکم بینی سەری لە دیواری کەعبە هەڵدەسوو، دەیناڵاند و دەیگوت: یا غەفور و یا ڕەحیم، خودایە خۆت دەزانی لە ئینسانی زاڵمی نەزان چ ڕوو دەدا.**

**خودایە عوزری کەمایەسیم هێناوەتە خزمەتان**

**تاعەتم نیە تاکو خۆی پێ دەرخەم ئەی ئەمان**

**خۆ گوناحباران تۆبەی دەکەن لە گوناحان**

**وە لە عیبادەت داوای لێخۆشبون دەکەن عاریفان**

**خوداپەرست پاداشتی عیبادەتیان دەوێ**

**بازرگانایش خێر و قازانجی شمەکیان دەوێ**

**منی قەلەندەر هیوام هێناوە نەك تاعەت**

**بۆ گەدایی هاتووم نەك تیجارەت**

**ئەوەم دەگەڵ بکە کە تۆ پێی شایەنی**

**دەمکوژی یا دەمبەخشی**

**هاتووم ڕووم لە قاپی ڕەحمەتە**

**بەندە هیچ کات فەرمانی نیە**

**هەرچی دەفەرمووی لاملیم نیە**



" شێخ عەبدولقادری گەیلانیان لە حەرەمی کەعبە بینی، ڕەحمەتی خودای لێ، ڕووی خۆی لە خاك و بەردوچکەکانی هەڵدەسوو، دەیگوت: ئەی خوداوەندی میهرەبان بمبەخشە!

ئەگەر قابیل بە سزام لە ڕۆژی قیامەتێ

بە کوێری هەڵمستێنەوە،

تاوەکو شەرمەزاری ڕووی چاکان نەبم.

## غەیبەتکردنی خەڵکی

" لە بیرمە بە منداڵی خواپەرستێکی چاك بووم، شەو زیندوو، سەرم چوبا شەو نوێژم نەدەچوو، زاهید و پەرهێزکار، دەم بەزیکر و ویرد و دوعا. شەوێك لە خزمەتی بابمدا _بە ڕەحمەتبێ_ لەسەر چۆکان دانیشتبووم, تەواوی شەوێ چاوم لێك نەنابوو، قورئانم دە مێزێدا بوو، خەریکی خوێندنی بووم، تاقمێك لە دروێشان لە دەور و پشتمان نوستبوون.

گوتم بابە! لەو خەڵکەی تاقیان هەڵنەستا دوو ڕکات نوێژان بکات، دە پرخەی خەوی بێ ئاگایی ڕاچوون, دەڵێی مردوون نەك نوستوو. گوتی گیانی بابەی ! ئەتۆش نوستبای چاکتر بوو لەوەی بکەویە بۆڵەو تانەی خەڵکی.

وێڕای ئەوەی چیرۆکەکانی گوڵستان بە پەخشانە و سەعدی هێندێ بەیت و شیعریش بۆ دڵنیایی داستانەکان و تێر و تەسەل کردنیان دێنێ, بەڵام هێندێ جار تەواوی داستانەکەی بە شێعر هێناوە لەوانە داستانی یاقوب پەیامبەرە، کە ڕۆڵە عەزیزەکەی لەلایەن براکانیەوە فرێدە درێتە چاڵاوێ.



" یەکێك لە پەیامبەر یەعقوبی پرسی: ئەتۆ بۆنی کراسی یوسفت لە میسرێرا هەڵمژی، بەلاَم چۆن بوو کە دەچاڵێ کەنعانێ هاوێـژرا نەتبینی؟ یاقوب فەرمووی : بینینی ئێمە وەك بروسکەی هەورە، بۆ ساتێك دونیا ڕۆشن دەکا و ون دەبێ، ئینسان هەرساتێ حاڵەتێکی هەیە، وەختی وایە لە عاسمانان دەگەڕێم، جاری واشە بەرپێی خۆم نابینم، ئەگەر قەلەندەر و خوداناس بۆ گەیشتن بە هەقی هەردوو جیهان هەمیشە لە یەك حاڵدا بوبا، خۆی لەدەست دەدا.

یەکێك لە کوڕ ونکردوەکەی پرسی
ئەی پیری گەورەی ڕۆشن ڕەوان
لە میسرێرا بۆنی کراست مژی
چۆن بوو لە چاڵاوێ کەنعانێ نەتدی
وتی ئەحواڵی مە وەك هەورە بروسکەیە
گەهێ پەنهانە و گەهێ پەیدایە
جاری وایە لە بەرزایدا ڕۆدەنیشم
جاری واشە نابینم بەرپێی خۆشم
ئەگەر قەلەندەر لە حاڵێکدا بمێنێ
لە هەردوو عالەم دەستی بەردەبێ

لە چیرۆکی یەکەمی بەشی دووەمدا سەعدی باسی لە خواپەرستێك کرد، کە تا ئەو وەختەی هەڵەی لێ دەرناکەوێ، پێویستە لە بەرێز و




چاكان نەژمار بكرێت، بەلاَم لە چیرۆكێكی دیدا قسە لە كەسێكی تر دەكا، كە عیبادەتەكەی بۆ خودا نیە و لە بەرخاتری سود و قازانجی دونیایی ئەنجامی دەدا, كە زیانی خۆ دەرخستن و ڕوالّەتی بە سەختی دەچێژێت.

**لە بێ ئەدەبان، ئەدەب فێر دەبین**

لە لوقمانی حەكیمیان پرسی: ئەدەب لە كێ فێر بووی؟ گوتی: لە بێ ئەدەبان، هەرچی ئەوانم پێ ناپەسەند بووە، خۆم لێ دوور گرتووە.

ئەگــەر بە گالّتەش قسەیەك بكــرێ
خــاوەن هۆش پەندی لێ وەردەگــرێ

بەلاَم سەد پەند بخوێنیتەوە بۆ ئەزان
هــەر گــالّتەی دێتە بــــەر گوێیان

**زاهید ناستێنێ**

لە چیرۆكێكی تری بەشی دووەمدا، سەعدی داستانێ لە میرێك دەگێڕێتەوە, كە كارێكی گرینگی دێتە پێش, دەستوریدا ئەگەر خواست و حەزی سەربگرێ, چەند درەمێك بەسەر زاهیدانی شاردا دەبەشێتەوە. كاتێ پێویستیەكەی هاتە جێ، پاشا كیسەیەكی درەم و دراو دایە دەستی پیاوێكی خۆی، تا بەسەر زاهید و خواپەرستان دابەشی بكات، كابرا ڕۆیشت و دوای ماوەیەك بێ ئەوەی بەدوای



زاهیداندا بگەڕێ، هاتەوە کۆشکی شا و پارە و پوڵەکەی دایەوە دەستی سوڵتان.

سەعدی هەمان چەشن داستانەکەی نەنوسیوە، کە کابرا لە زاهیدان نەگەڕابێ، بەڵکو دەڵێ: نۆکەری شا عاقڵ و هۆشیار بوو، بە ڕۆژێ دەگەڕا و شەوێ دەهاتەوە, واتە چونکە وشیار و ئاقڵ بوو ماوەیەکی ئاوا گوزەراند و پارەکەی گەڕاندەوە و گوتی: هەرچەندی گەڕام زاهیدم نەکەوتنە بەرچاوان، سوڵتان گوتی: ئەوە چ قسەیەکە؟ تا ئەو جێی من دەزانم لەو مەملەکەتەدا چوارسەد زاهیدی تێدایە، کابرا گوتی: ئەی خوداوەندی جیهان، خۆ ئەوەی زاهیدە وەرناگرێ و ئەوەشی وەردەگرێ زاهید نیە.

زاهید کە وەریگرت دینار و گوتی بێنە
ئەتۆ زاهیدترێك لەو بە دەست بێنە

سەعدی شیرین گوفتار، شۆخی و ڕەزا سوکیش خەسڵەتێکی تریەتی، لە پەروەردەی ئەخلاقدا لە قسە خۆش و تەنزەکانی خۆی بەهرەمەندمان دەکات ئەو چیرۆکەش لەو بابەتەیە.

" قەلەندەرێك بە پیرەکەی خۆی گوت: لەو خەڵکە ڕەنجاوم، هێندەم دێنە زیارەتێ، وەختی خۆم لێ تێکچووە، پیر گوتی : ئەوی هەژارە قەرزی بدەیە , ئەوەشی دەوڵەمەندە داوای شتی لێ بکە، نیدی لە کۆڵت دەبنەوە.



**گرفتارم نەك گوناحبار**

" خواپەرستێکم لە قەراغی دەریا چاو پێکەوت، پڵینگ پەلاماری دابوو، برینی تێ ببون، خوێنی لێ دەچۆڕا، بە هیچ دەرمانێك برینی سارێژ نەدەبوو، عەیامێك بەو برین و ئازارە نالاندی و دەگەڵ ئەوەش دایم شوکرانەی دەگوت، وتیان ئەتۆ خەریکی سوپاسی چی دەکەی؟ گوتی: سوپاسی خودا دەکەم کە تووشی دەرد و موسیبەت بووم نەك گوناح و تاوان.

**دلاوایی باشترە یا دلێری**

لە حەکیمێکیان پرسی دلاوایی و ئازایەتی کامیان باشترە؟ گوتی: ئەوەی کە دلاوا و بەخشندەیە پێویستی بە ئازایی و دلێری نیە.

**لەسەر کێلی بەهرامـــی گـۆڕ نووسراوە**

**دەستی بەخشش چاکترە لە دەستی زۆر**

***********





چـــــه خـــوش بـاشد آواز نرم حزین
بـــه گـــوش حـــریفـــان مست صبوح
بـــــه از روی خـــوب است آواز خـوش
کة آن حظ نفس است و این قوت روح

چەندە خۆشـە ئـاوازی نـەرمی حەزیـن
لە گـوێی حەریفـــانی مـەستی بـەیـان
ئاوازی خۆشم پێ جوانترە لە ڕووی جوان
ئـــەو بەشی نەفسە، ئەمیان قوتی گیـان

" لە بابی سێیەم"

********








**بەشی سێیەم: باسی فەزیلەتی قەناعەت**

لەو بەشەدا سەعدی داستان گەلێك دەگێڕێتەوە، کە پێویستە ئینسان لە ژیاندا لە جێی تەماحکاری قەناعەت بکاتە پیشە، لە لاشە پەروەری بالاتر بڕوانێ، گیان پەروەر بێ، دەستی تکا و داوا بۆ ئەوانی دی درێژ نەکا، تەنێ بۆ ڕاحەتی جەستە تێنەکۆشێ و گیانیش وەلانێ. نێوەندگیری لە خەرجی و کەم خۆری و خۆپارێزی لە ورگ تێری، کە هۆی سەرەکی نەخۆشیەکانی جەستە و نازاردانی گیان و ئیدراکی ڕۆحانیش لێڵ دەکات. لەسەر ئەوەش چەندین چیرۆکی پڕ لە حیکمەت دێنێ.

لە باسی ڕەوشتی ئەردەشێر بابەکاندا هاتووە کە لە حەکیمێکی عەرەبی پرسیوە، پێویستە ڕۆژێ چەندە خواردن بخورێ؟ ئەویش دەڵێ: کێشی سەد درەم زیو بەسە، گوتیان ئاخر ئەوەندە خواردنە کوا هێز و توانا دەدات؟ وتی: ئەو ئەندازەیە تۆ هەڵدەگرێت، خۆ ئەگەر زیادی کەی ئەتۆ باربەری و حەمباڵی وی دەکەی.

خوردن برای زیستن و ذکر کردن است
تو معتقد که زیستن از بهر خوردن است

خواردن بۆ ژین و زیکر کردنە
تۆ پێت وایە ژیان هەر بۆ خواردنە؟

هەر لە بارەی کەم خۆریەوە لە دەردە دارێکیان پرسی دڵت چی دەوێت ؟ گوتی هەر ئەوەی کە دڵم هیچی نەوێ و نەبا.



**گەدە کە پڕ بوو سك نەخۆش دەبێ**
**هیچ هۆیەکـــی خۆشی سودی نابێ**

**سەبر گرتن لە سەر هەژاری**

**سەعدی و مەزنانی ئەخلاق، ئامۆژگاری دەکەن کە دۆخ و دارایی و ماڵێ خۆت دەگەڵ خوارتر بەرانبەر بکە، چاو لە خوار خۆت بکە، نەك سەروتر، بەڵام لە وەدەست هێنانی دانایی و زانستدا پێویستە چاو لە سەرتر و زاناتران بکەیت و بکۆشی تا لە داناییدا بڵندتر بڕۆیت.**
**غەم و پەرۆشی بۆ کەمێك ماڵ، بێجگە لە حەسرەت و نائومێدی سودێکی لێ هەڵناوەرێت. هەروەك ئەو داخەش بێ پایانە، چونکە هەمیشە سەروەتدارتر هەیە و خەمی نەگەیشتن بە وان، تەواوی تەمەن دادەگرێ و خەسڵەتی نا پەسەندی وەك تەماحکاری و چاو برسیەتی دەرەنجامیەتی.**
**سەعدی ئەم بابەتە لەم چیرۆکەدا باشتر ڕون دەکاتەوە.**
**".. هەرگیز لە چەرخی زەمانە نەکەوتبومە پرتە و بۆڵە و ڕووی خۆم بە هاتوچۆی ڕۆژان ترش و تاڵ نەکرد بوو، ئەوێ ڕۆژێ نەبێ کە بێ پێڵاوم ون ببوون، بە دڵ تەنگیەوە چومە مزگەوتی گەورەی کوفە، لەوێ یەکێکم بینی قاچی پێوە نیە، کە ئەوەم بینی سوپاسی خودای بەخشندەم کرد، لەسەر بێ پێڵاویش دانم بە خۆدا گرت.**

**ئارەزووە دوو ڕو درێژەکان**

**لە چیرۆکی پێشوو گوتم ئەو کەسەی ژیانی خۆی دەگەڵ بالآتر و دەوڵەمەندتر لە خۆی بەرانبەری بکا، دوچاری ڕژدی و تەماح و چاو**



**برسیەتی دەبێ، ئەم چیرۆکەش باسی تەماح و حیرسی بازرگانێکە کە وێڕای هەبوونی سەروەتێکی فراوان، ئارەزووی بەدەستهێنانی ماڵی زیاتری لە مێشك دێ و دەچێ، سەرقاڵی چەندین سەفەری بازرگانی و کڕین و فرۆشتنە، سەرباری ئەوە سەفەرێکی دیکەی لە خەیاڵدا بوو، بەڵام سەفەرێك وەك دنیاگەڕ تەمەنێکی دیکەی داوا دەکرد:**

**" بازرگانێکم دی سەدو پەنجا حوشتر و چل خزمەتکاری هەبوو , شەوێك لە دوورگەی "کیش" ئەمنی بردە ژوورەکەی خۆی، تەواوی شەوێ چاوی لێك نەنان، ئۆقرەی نەبوو، لەبەر خۆیەوە ورتە ورتی بوو، فلان ئەنبارم لە تورکستانە و فیسار کاڵا و کوتاڵم لە هیندستانە و ئەوە قەباڵەی فلان زەویەمە و ئەو ماڵەشم فلانە کەس کەفیلیەتی، جارێ دەیگوت دەمەوێت بچمە ئەسکەندەرییە ئاو و هەوای خۆشە، جارێ دەیگوت نا، دەریای ڕۆژئاوا هاڵۆزە، جەنابی سەعدی سەفەرێکی دیکەشم لە بەرە، ئەگەر بێتە پێش، ئنجا ئیدی ئەوەندە تەمەنەی ماوە لە گۆشەیەك دادەنیشم، گوتم کام سەفەرەت مەبەستە؟ گوتی: دەمەوێت گۆگردی خاکی فارس بۆ وڵاتی چین ببەم، دەڵێن لە وێ نرخێکی زۆر دەکات، لە وێشەوە قاپ و قاچاغی چینی ببەمە ڕۆم و قوماشی ئاوریشمی ڕۆمیش بۆ هیند و پۆڵای هیندیش بۆ حەڵەب و ئاوێنەی حەڵەبی بۆ یەمەن و کەتانی ئەوێش بۆ وڵاتی فارس، ئنجا دوای ئەوە واز لە بازرگانی دێنم و بۆخۆم دوکانێك دادەنێم و گۆشەی تەنیایی هەڵدەبژێرم. کابرا لەو ئاوات و خولیایەدا هێندەی گوت، بێ تاقەت بوو، لە گوتن کەوت. ئنجا گوتی: سەعدی ئەتۆش لەوەی دیوتە و بیستوتە قسەیەك بکە، ئەمنیش گوتم:**



بـیستووته کــە، ڕۆژێ بــازرگــانێ
لــە بیابان لە ئێستڕێ کەوتە خوارێ

گـــــــوتی چاوی تەنگی دونیا خۆر
یا قەناعەت پڕی دەکا یا خاکی گۆڕ

**ڕزق و قیسمەت**

" ماسی گرێکی لەڕ و لاواز ماسیەکی گەورەی کەوتـە داوێ، تاقـەتی پـێ نەشـکا، ماسـیەکە بەسـەریدا زاڵ بـوو، داوەکـەی لـە دەسـتان فڕانـد و ڕۆیشت، ماسی گرەکـانی دی لـە حـەیفان کەوتنـە سـەرکۆنەی ڕاوچـی، بۆچـی و چـۆن ماسـیەکی ئـاوات بـۆ هەڵکـەوت و پێـت ڕاو نـەکراوە ! ئـەویش گـوتی: گـەلۆ چـی بکـەم ؟ ئـەو ماسـیە ڕزقـی مـن نـەبوو، ماسیەکەش ڕۆژ و ڕزقی خۆی مابوو.

ڕاوچی سەر بێ ڕزق، لە ئاوێ دیجلەی ماسی پێ ناگرێ
مـــاسی بێ نەجـــەل لـــە وشکانیش نــــــــامرێ

**لە حاتەمی تاییان پرسی:**

تـا وێـستا کەسـی لـە خـۆت پیـاو تـر و بـە هیمـمـەت تـرت بینیـوە یـا بیستووە؟

گـوتی: بـەڵێ. ڕۆژێـك چـل حوشـترم بـۆ میرەکـانی عـەرەب کردبـوە قوربانی، بۆ کارێك ڕێم کەوتە سارا. گوێنی بـڕێکم دی کۆڵێکی دڕك و




داڵ کۆ کردبوونـەوە، لێم پرسـی بـۆ ناچیە میـوانی حاتـەمی تـایی کـە خەڵکێك زۆر لە سەر سفرە و خوانی خڕ بوونەوە؟

گوتی: هەر کەس نانی دەست و کاری خـۆی بخـوا منـەتی حاتـەمی تـایی هەڵناگرێ.

من ئەوم بە هیممەتر و جوامێر لە خۆم سەرووتر بینی.





**سخن گرچه بود دلبند و شیریـــن بود**
**ســزوار تصــدیـــق و تحسیـــن بـــود**

**چـــــو یك بار گفتی، مگو بـــاز پس**
**کـــــه حلوا چو یك بار خوردند بس**

**ئەگەر چی قسە دڵبەند و شیرین بێ**
**شیاوی بە ڕاست و جوان دیتن دەبێ**

**کە جارێك گوترا، دیسان مەیکـــــەوە**
**چون، کە حەڵوا خورا دوبارە نابێتەوە**

**"لە بابی چوارەم"**

**بەشی چوارەم: سودی خامۆشی**

سەعدی شیرازی ئامۆژگاری دەکا، تا پێویست نەبێ زمان نەگەڕێ، لەو جێگایەش خامۆشی ڕەوا نیە، کە پێویستە زار هەڵبڕێ. سەعدی تانە لە قسەکردن و بێ دەنگی نا بەجێ دەدا و بە کارێکی نەشیاو و بێ ئەقڵی دەزانێ. دوو شت ئەقڵ دەڕوخێنن: وتن لە وەختی بێ دەنگی، کاتی وتن، بێ دەنگی.

لە هەموو شتێ دوان نا بەجێیە، بۆنمونە باسکردنی زەرەر و زیانی خۆت بۆ ئەوانی دی.

".. بازرگانێك هەزار دیناری زەرەر وێ کەوت، بە کوڕەکەی گوت: نابێ ئەو باسە بۆ کەس بگێڕیەوە. گوتی بەسەر چاو بابە، باسی ناکەم، بەلاّم دەمەوێ بزانم سودی نەگوتن و ئاشکرا نەبوونی چیە؟ گوتی: تا خەم و زەرەرەکە نەبنە دوو، یەکیان خەسارەتی دەستمایە، ئەویدیشیان دڵخۆشی و دراوسێیە.

سەغڵتی خۆت لەلای دوژمنان مەڵێ
خۆشی دەدڵی دەگەڕێ و لا حەولەش دەڵێ

هەر لە ئامۆژگارییەکانی سەعدی، ئینسانی زانا نابێ دەگەڵ نەزانان دەرگیر و دەستە و یەخە بێ.

" جالینوسی حەکیم و پزیشکی یۆنانی ١٣١ -٢١٠ ز) گێلێکی دی، یەخەی دانیشمەندێکی گرتبوو بێ ڕێزی پێدەکرد. جالینۆس گوتی: ئەگەر نەفام نەبا، کاری بەو جێیە نەدەگەیشت.

لـــــە نێوان دوو ئاقڵاندا نابێتە هەرا

زانــا دەگەڵ نەزانان لێی نـــابێتە هەرا

نەفـــام ئەگـــەر بـــە توندیش هاڵۆز بێ

دانا زۆر بە نـــەرمی دڵـــی تێکـــەڵ دێ

دوو دۆست چـــاویان لـــە تـــاڵـــە مویە

کەلێن دروستنەبێ و تێکنەچێ نێوانیان

کـــە هـــەردوو لا نەفام بن، تینێ بێنن

ئـــەگـــــــــەر زنجیریش بێ دەیپسێنن

خـــــوو بـــەدێك جنێوی دا بە پیاوێك

هـــەڵیگرت و گـــــوتی ئەی پیاوی چاك

ئـــــــەمن لـــەوە بەدترم کـــــە دەیزانی

خـــــۆ عەیبەکانی من وەك خۆم نازانی

********************

**لە نێوەندی گفتوگۆی ئەوانی تردا**

هێندێ لە ئاداب و ڕەوشتی پێکەوە ژیان دەگەڵ ڕۆیشتنی زەمان, لە ڕۆژگاری مەدا گرینگی زیاتری بەخۆوە دیوە، بێدەنگ بوونە لە وەختی قسەکردنی خەڵکی تردا، خۆ دوور گرتن لە گوتە گوت و قسەی ئەم و ئەو. لەو بارەیەوە سەعدی لە چیرۆکێکدا دەڵێ:

" لە حەکیمێکم بیست دەیگوت: هەرگیز کەسێ دانی بە نەزانینی خۆیدا نەهێناوە, مەگین کەسێك بەر لە تەواو بوونی قسە و گوفتاری یەکێك دەست بە قسان بکات.

نەی ناقڵمەند قسە و وتار سەرو بنی هەیە
لە نێوەڕاستی قسـاندا قسە مەهێنە

ئینسانی خاوەن هۆش و فەرهەنگ تا نەبینێ کە خەڵك بێ دەنگە، دەست پێ ناکا.

بەباوەڕی سەعدی، یەك لە دابی قسەکردن و مەرجی ڕەوانی و ڕەوانبێژی وتار, دوبارە نەکردنەوەی قسەیە, خۆ ئەگەر پێویستیشی کرد، دەبێ وشە و دەربڕینەکان بگۆڕدرێن.

سەحبان وائیل[10] لە وێژەو بێژەدا بێ وێنە دانراوە, چونکەساڵێك بۆ کۆمەڵە خەڵکێ دواو هیچی دوبارە نەکردەوە, ئەگەر بابەتەك هاتباوە پێشێ، بە دەستەواژەی دیکە دەریدەبڕیەوە, ئەوەش یەکێکە لە ئەدەبی حزوری شاهانە.

---

[10] سەحبان وائیل : وتار خوێنی ناوداری عەرەب ٦٧٤ ز مردووە نموونەی ڕەوانبێژییە.



**ئەگــەرچی قسە دڵبەندو شیرین بێ**

**شیاوی بــە ڕاست و جوان دیتن دێ**

**کــە جارێك گوترا، دیسان مەیکەوە**

**چون کە حەڵوا خورا دوبارە نابێتەوە**

**ناخۆش ئاوازێك**

**یەکێ لەو بابەتانەی سەعدی لە بەشی بێدەنگیـدا هێناویـەتی، کەسـێ کە دەنگی ناخۆش بێ، واباشترە بێدەنگ بێـت. سـەعدی سـێ داسـتان لـە بارەی دەنگ ناخۆشـێك دەگێڕێتـەوە، کـە لـە سـودەکانی بێدەنگیـە و لـە کۆتا بەشەکانی گوڵستانە. یەك لەو سێ داستانە دەگێڕمەوە:**

**" کابرایەك لە مزگەوتی سنجار —موصل- بـە خێـرا خـۆی بـانگی دەدا، خەڵکی کەوتنە پرتە و بۆڵەی و خاوەن مزگەوتیش میرێکی عـادڵ بـوو، ڕەوشت چاك، نەیویست دڵی بانگدەر بێشێنێ، پێی گوت:**

**جوامێری بـەڕێز، ئـەو مزگەوتـە چـەند کۆنـە بانگـدەرێکی هەیـە، هـەر یەکەیان پێنج دیناری دەدەمێ، ئەگـەر لـە مزگـەوتێکی تـر بـانگ بـدەی دە دەینـار دەدەمـە تـۆ، ڕێـك کـەوتن و ڕۆیشـت، دوای ماوەیـەك لـە ڕێ گوزەرێـك دەگـەڵ مـیردا تێکهەڵەنگوتنـەوە، گـوتی جـەنابی مـیر: ئـەتۆ زوڵمت لێکردم بە دە دینار لەو مزگەوتە دەرتکردم، ئـەو شـوێنەی بـۆی چـوم بیسـت دینـارم دەدەنـێ بـڕۆم، قبـوڵی ناکـەم، مـیری عـادڵ، تێـر پێکەنی، نا نا نەڕۆی، تا پەنجا دینارت نەدەنێ قبوڵی نەکە.**

بە تەمشوێ کەس بـــەرد لـــە گڵ ناتاشێ

وەك بانگی ناخـۆشی تـــۆ کــە دڵ دەتراشێ

نە هر سخن کە بر آید، بگوید اهل شناخت

بـــە سر شاە خویشتن نشـــاید بـــــاخت

هـەرچی ڕوویدا ئـــــاقڵ گورج نایدرکێنێ

بـــە نهێنی پاشـــــا سەری خۆی نادۆڕێنێ





**هـر کجـا سلطـان عشق آمـد نمـاند**

**قـــوت بـــازوی تـــقـوا را مـحـل**

**سوڵتـانی عیشق ڕوو بـکاتە هەر شوێنێ**

**هـیـچ هێز و تـوانایەك بۆ تەقوا نامێنێ**

**دلارامـی کـــه داری دل در او بـند**

**دگـــر چشم از همه عـــالم فرو بـند**

**ئەگەر دڵارامێکت هەیە دڵێ پێوە ببەستە**

**ئیتر چـاوان لە هەموو عالەمێ ببەستە**

**" لە بابی پێنجەم"**




**باسی پێنجەم: عیشق و لاویەتی**

هەمان چەشنی پێشوو، سەعدی تەواوی بابەت و دۆخ و حاڵەکانی ئینسان لە گوڵستاندا دێنێ و مەبەستیشی هیدایەت و ڕێنوێنییە, تا جوانی چاکەو ناشرینی ناپەسەند، لە چیرۆکەکانی خۆیدا بە زمانی داستان بێنێتە پێش, گۆیاتر لە زمان دەرەنجامی ماجەرایە، لێرەوە پەروەردەو ئامۆژگاری خۆی پێشکەش دەکات.

لەم بەشەدا هەم لە خۆشەویستی پاك و بێ خەوش هەمیش لە هەوەس و ئارەزووەکان قسێ دەکات, خوێنەران لە چاکی و بەدی ماجەراو ڕووداوەکان هۆشیار دەکاتەوە.

**با لێرەش چەند گوڵێك لە باغی عیشق و جوانیەکە بچنین..**

" لە بیرمە لە ساڵانی پێشوو، من و دۆستێکم وەکو دوو دنك بادەم لە توێکڵێکدا بووین, هاوڕێ و دۆستیمان خۆش بوو، لە پڕ دابڕانێك ڕوویدا، دوای ماوەیەك پەیدا بویەوە، دەستی کرد بە گلەیی و بۆڵە, بۆچی لەو ماوەیەدا کەست نەناردووەمە لا، گوتم: پێم خەفەت بوو دیدەی قاسید بە جەماڵی تۆ ڕۆشن بێ و ئەمنیش بەشم تێ نەبێ.

حەسودیم برد نیگای تۆ بکا کەسێ
خۆ لە نیگای تۆ تێر نابێ هیچ کەسێ



" خواپەرستێکم بینی بە موحیبەتی یەکێك گرفتار بوو بوو، هێزی دەبەردا نەمابوو، نە تاقەتی سەبر و نە توانایی گوفتار. سەرکۆنەی زۆری کرا بەلاّم تەرکی گیرۆدەیی نەدەکرد. جارێك کەوتمە لۆمە کردنی و گوتم: ئەقڵی گرانبەهات چی لێهات کە نەفسی خەسیست زاڵ بوو؟

گوتی:

هر کجا سلطان عشق آمد نماند

قوت بازوی تقوا را محل

سوڵتانی عیشق ڕوو بکاتە هەر شوێنێ

هیچ هێز و توانایەك بۆ تەقوا نامێنێ

در چشم من آمد آن سرو بلند

بر بود دلم ز دست و در پای افگند

این دیدەی شوخ می برد دل بە کمند

خواهی کە بە کس دل ندهی دیدە بند

ئەو سەروی قەد بڵیندە کە هاتە بەرچاوان

دڵم لە دەست بەربۆوە و کەوتە بەر پێیان

چاوی ئەو شۆخە دڵ دەبا بە کەمەند

گەر دەتەوێ دڵ بە کەس نەدەی ببەستە چاوان



لە چیرۆکێکی تەنز ئامێزدا باسی کەسێك دەکا، کە ژنە جحێڵەکەی دەمرێ، کابراش چونکە توانادار بوو، خەسووەکەی لە ماڵێ کچێ ماڵێ دادەنێ.

" کاورایەك ژنێ جوان و جحێڵی دەمریت، خەسوی خەرفاویش لەبەر مارەیی کچەکەی، لە ماڵی زاوا، دایکوتاو ماڵی دانا, زاوا لە داخان حەجمینی نەبوو، چارەی خەسوێی نەدەهاتێ، ڕۆژێکیان دەستەیەك لە ئاشنایان هەواڵیان پرسی، یەکێکیان گوتی لە دووری یاری عەزیزت حاڵت چیە؟ گوتی: نە دیتنی ژن بۆ من هێندە دشوار نیە وەك دیتنی خەسوو.

گوڵ بە تالآن ڕۆیی و دڕك و داڵ مـــایەوە
خەزێنەیان هەلگرت و مار لە جێی مایەوە

چـــاوی خـــۆت لەسەر نوکی ڕم ببینی
خـــۆشترە لـــــــەوەی ڕێی دوژمن ببینی

**داستانی مەجنون**

داستانی "مەجنونی لەیلێ"یان، بۆ پاشایەکی عەرەب گێڕایەوە، باسی حاڵ و دۆخی ئەو دوو خۆشەویستەیان کرد. سەعدی لێرەدا ناوی مەجنون دەخاتە پاڵ لەیلێ، بە "مەجنونی لەیلێ" ناوی دێنێ، هەم تامێك دەداتە وشەکە و هەم هۆی نێودێری (قەیس)یش بە مەجنون ڕوون دەکاتەوە. لە داستانی نێوداری لەیلێ و مەجنون، کە لە بنەڕەتدا ناوی قەیسەو لە عیشقی لەیلێدا دێوانە دەبێ و دەکەوێتە کێوان،



لەبەر ئەوە ناوی نراوە مەجنون. لە دەستەواژەی ( مەجنونی لەیلێ ) هەر ئەوە دێتە خەیاڵ کە مەجنون عاشقی لەیلێ بووە و بەس، وا دەزانرێ شۆرەت و نێوداری مەجنون لە ناو پێڕی ئاشقانی جیهان تەنیا بە هۆی لەیلێ و عیشقی ئەوە. درێژەی داستان لە زمانی سەعدی ببیستن:

" مەجنون تەواوی هۆش و هەستی لە دەست داوە و کەوتۆتە پێدەشت و بیابان, پاشا فەرمانی کرد بیهێنن، مەجنونیان هێنایە کۆشکی شا, پاشا کەوتە سەر کۆنەی، لە نێو گرۆی ئینساندا چ کەم و کەسریەکت دیوە، وا تەرکی ژینت دەگەڵ ئینسان کردووە و رووت کردۆتە دەشت و خوت بە ئاژەڵانەوە گرتووە؟

دۆستانم لە خۆشەویستی لەیلێدا لۆمەیان کردم
ئای کە ڕۆژێ دەبینرا، دەزانن بۆ وا شێتی کردوم
خۆزگە ئەوانەی لێم دەدەن تانێ
ڕووی تۆیان دیبا دڵستانێ
تاکو لە دیتنت لە باتی میوە
بێ ئاگا دەستی خۆیان دەبڕیەوە

بۆنەوەی ڕاستی بابەتەکە دەرکەوتباو شایەتی دابا ﴿ فذلك الذي لمتنني فيه ﴾ یوسف ٣٢. واتا: ئەوە ئەو کەسەیە کە لەسەر ئەو سەرزەنشتی منتان دەکرد.



پاشا حەزیکرد جەماڵی لەیلێ ببینێ، تا بزانێ چلۆن جوانێکە ئەو هەموو بەڵاو سەرگەردانیەی ناوەتەوە, فەرمانی کرد بیهێنن, بە نێو هۆزەکانی عەرەبدا گەڕان و دیتیانەوە, هێنایانە بەردەمی پادشا, پاشا تەماشای کرد، هەرچەند لێی دەڕوانی نەیدەهاتە بەرچاوان, چونکە ناشرینترین کارکەری کۆشکی، بە قەدو قیافە لەوی جوانتر بوو. مەجنون بە دڵ تێگەیشت و گوتی: بۆ جەماڵی لەیلێ پێویستە لە سیلە چاوی مەجنونەوە لێی بڕوانی، تا نهێنی و ڕازی بۆ تۆ دەرکەوێ.

دەردی برینیان نیە تەندروستان
دەردی دڵی خۆم ناڵێم بێجگە لە بۆ هاودەردان
گوتن لە زەردەواڵە سودی نیە
بۆ ئەوانەی هەرگیز نەیاندیووە پێوەدان
تا ئەتۆش وەك ئێمە تێنەگەی
لە لای تۆ هەروەك ئەفسانەیە حاڵمان
سوتانی من وەك ئازاری خەڵکی نیە
ئەو خوێی بە دەستە و ئەمنیش برینم تێیە

٭

لە ترسی گیان، دڵ بەردان لە خۆشەویست و میهری گیانان،
مەرجی خۆشەویستی نیە
کە تۆ هەر خەریکی خزمەتی لاشەی
ئەشق بازێکی درۆزنی..



ئەگەر بۆت ڕێ نەکەوت گەیشتنە یارێ

خۆ مەرجی ئیشقە مردن لە داوی یارێ

*****

مگــر ملایکه بــر آسمان وگـــــــر نه بشـر

به حسن صورت او در زمیـــــــن نخواهد بود

تــا تـــــوانم دلـــت بـــــه دســـت آرم

ور بیـــــــازاریـــــــم، نیـــــازارم

بـــــا ایـــــــن همه جـــور و تند خوی

بـــــارت بکشـــــــم کــــه خـوب روی

*****

مــەگین فریشتە لە ئاسمــان، وەگــەر نا ئینسانێ

بە وێنەی حوسنی سورەتی وی نیە لەسەر زەمینێ

تـــــا دەتـــــوانم دەڵت بــە دەســت دێنم

خــۆ ئازاریشم بــــــدەی، من نەزیەتت نــادەم

دەگـــــەڵ ئــەو هەموو جــەور و تونــد خوویی

نــــــازت دەکێشم چـــون شـیـرین ڕوویـــی

****************



**دەورانی گـــەنجیم هەمــووی لە دەست چـــوو**
**هـەر ئاخ و داخمە بۆ زەمانی دڵگیری ڕۆیشتوو**
**ئەما هێزی ســەرپەنجـەی شێریم ئەوی هەمبوو**

**" لە بابی شەشەم"**



**بەشی شەشەم: پیرو لاوازی**

لەو بەشەدا هەم لە فەزیلەتی پیری و ساڵداری، هەم لاوازی، قسێ دەکا و داستان دێنێتەوە، سەعدی ئامۆژگاری لاوانیش دەکا، کە ڕێزی گەورە و پیران بگرن، هەم لە پیرانیش دەخوازێ بە ڕەفتاری دڵاوێز و باوکانە مامەڵە لەگەڵ گەنجان بکەن، دەستیان بگرن و ڕێی چاکیان نیشاندەن، گەنجانیان خۆشبوێ.

لەم چیرۆکەی خوارێ، منداڵێکی ئەمەك نەناس تامەزرۆی مەرگی باوکیەتی, لە حاڵێکدا باوکی چەندان ڕاز و نیازی دەگەڵ خودا کردووە تا ئەو ڕۆڵەیەی بداتێ.

" لە دیاربکر میوانی پیرێك بووم خاوەن ماڵێکی زۆر و زەوەند، کوڕێکی ڕەنگ و ڕوو جوانیشی هەبوو, شەوێکیان قسەی بۆ دەکردم کە لە ژیانیدا هەر ئەو منداڵەی هەیە و بەس، گوتی: لەو ئاقارە دارێکی لێیە، مەزارگەیە، خەڵکی بۆ ڕاز و نیاز دەچنە زیارەتی، شەوانی دوور و درێژ لە بن ئەو دارە ڕاز و نیازم دەگەڵ خودا کردووە و پاڕاومەوە تا خودا ئەو ڕۆڵەی پێداین. گوێم لێ بوو کوڕە بە چپە بە دۆستەکانی دەگوت: ئەگەر دەمزانی ئەو دارە لە کوێیە دەچووم دوعام دەکرد بەشکم خودا بابم بباتەوە، خواجە خۆشحاڵە کوڕی هەیە و کوڕیش تانەی لێدەدا باوکم پیر و خەڵەفاوە.



**دەوڵەمەندێکی چرووک**

دەوڵەمەنـــدێکی چاوبرسـی کورەکـەی نـەخۆش بـوو، پیاوچـاکان پێیـانگوت وا چاکە خـەتمێکی قورئـان یـان قوربـانی بـۆ بکەی، بەشـکم خودا شـیفای بـدا، تـۆزێ رامـاو گـوتی خـەتمی قورئـانێ باشـترە. خـاوەن دڵێك ئەو قسەی بیست و گـوتی: خەتمەکەی بۆیـە پـێ باشـترە چونکە قورئانەکە لەسەری زمانە، پارەش لە بنی گیانە.

بـــۆ دینـــارێ وەك کەر لە قوڕێدا دەمێنێ

ئەلحەمدێ بخوێنـێ ئەو سەد دانە دەخوێنـێ

**شکاندنی دڵی دایك**

کاتێ بە نـەفامی بەسـەر دایکمـدا نەڕانـدم، دایکـم بـە دڵـی شـکاوەوە لـە سیلەیەك دانیشت و بە گریانـەوە دەیگوت: مەگـەر وردیلـەیی خـۆت لـە بیرکردووە ئەوێستا وەها زبری و توندی دەنوێنی.

ئەگەر دەورانی بچوکیت دەهــاتەوە بــیر

کە بێ دەسەلآت بـــوی لــە باوەشی مـن

ئەورۆ لــە گەڵتدا نەدەکـــــردم زۆرداری

ئێستا کە تــۆ شێری و منیش پـیـرەژن





هــــرکــه در خـــردیـــش ادب نـکنند

در بزرگـــــی فـــلاح از او بـــرخـــاست

چـــوب تـر را چنـان کـه خـــواهی پیچ

نـشود خشك جـــز بـــه آتـــش راست

هەر کەس بەمنــداڵی فێــرە ئەدەب نەبێ

لە گــەورەیـــدا ســـــەرکـــەوتوو نابـــێ

داری تـــەڕ دابــــێنە چـــۆنـــت دەوێ

وەلێ داری ئیشك بەبێ ئاور ڕاست نـــابێ

" لە بابی حەوتەم"



**بەشی حەوتەم: پەروەردە**

لەو بەشەدا سەعدی مەزن کە گەورەترین مامۆستای پەروەردە و ئەخلاقە، لە شیعر و ئەدەبی فارسیدا, پەروەردە و دروستکردنی ئینسانێکی دروست بە جوانترین وشە و هێنانی چیرۆك و داستان چین چین بەدوای یەکدا دێنێ.

سەعدی پێی وایە هەموو ئینسانێك قابیلی پەروەردە و گەورەبوونە, مەگین ئەو کەسەی لەبەرانبەر پەروەردەدا کەلەپوتی بنوێنێ و گوێ شل نەکا و نەیهەوێ لەسەر ڕچەی ئینسانیی ڕەوتی ژین بەرێ بکات.

میرات و کەلەپوری شێخی سەعدی سەرجەمی پەروەردە و ئەخلاقە.

سەعدی لە جێگایەکدا دەڵێ: گڵێك هاودەمی گولأن بکات , بۆنی گولأن دەگرێ.

ڕۆژێك مستە گڵێ لەلایەن خۆشەویستێکەوە گەییە دەستم

گوتم ئەتۆ میسکی یا عەنبەری, لەبۆنی دلأوێزت شاد و مەستم

گوتی گڵێکی نابوت بوم، وەڵێ بەینێ دەگەڵ گولأن ڕۆنیشتم

لە هاونشینیدا کاریان تێکردم، وەگەرنا من هەر ئەو خاکەم کەهەم

**لە جێگایەکی تردا دەفەرموێ:**

زەمینی کرێن خۆ گولأن ناڕوێنێ

لە تۆیی و کار،جگە لە ماندویی هیچت بۆ نامێنێ

شمشێری چاك کوا لە ئاسنی خراپ ساز دەبێ

ئەی دانا، ناکەس بە تەربیەت کوا دروست دەبێ



سەعدی شیرازی

**کەس گومانی نیە لە نەرمی و نازکی بارانێ**

**لە باخدا گوڵ و لە کرێنیش درك دەڕوێنێ**

**مرۆڤ بۆخوی کائینێکە تەربیەت و فێرکاری قەبوڵ دەکا، ئامادە سازیەکی بۆ وەرگرتنی هەردوو بەش هەیە، کە لەگەڵ هیچ گیانەوەرێکی تر بەرانبەر ناکرێ، بەلاّم بۆ هەر خواست و ئارەزویەك، ویستێك پێویستە، لە بچوکترین نیازی بەدەنی تاکو والاّترین پلەی رۆحانی.زۆرێك لە مندالاّنی شەڕاوی لە گەورە بونیاندا گۆڕاون و پێگەیان بەدەست هێناوە، ئەوەش بەلگەیەکی رۆشنە، ئینسان بە دەستخۆیەتی ئەگەر بیەوێ لە شەڕ و خراپەی نەفس پەرهیز بکا و بکەوێتە سەر رێ.**

**لەسەر ئەوە پێچەوانەی هێندێ لەوانەی گومانی بەد بە خەلکی دەبەن, هەر خوو سروشتێك زەمینەی بەدی و چاکی هەیە و هەلبژاردنیان بە ئینسان خۆیەتی, لە حالێکدا لە گیانەوەراندا ئەو بژاردەیە نیە.**

**ئێشی دوپشکێ خۆ لە ڕقەوە نیە**

**سروشتی پێوەدانی هەر وایە**

**ئەلبەتە نابێ ئەو خالە بە دوور بگرین کە خولق و خوی پەسەند یا بەد، بە پێی زەمان لە ئینساندا جێگیر دەبێ و ڕەنگ دەگرێ. ڕاهاتن و دووبارەی هەر ڕەفتارێك، ئینسان لێی دەبێتە داب و عادەت, بەرە بەرە کردەوە بەردەوامەکان لە ئینساندا جێ دەگرن و خویان پێوە دەگیردرێ. خوەکان لە ئەنجامی چەند بارە کردنەوە و مومارەسەی**



ئـەخلاقی بـەدە، کەوتنـە نـاو ڕەوشـتی بـەدیش نەتیجـەی هاونشـینی دەگەڵ بەدانـە, کـە مـەزنانی پـەروەردە و ڕەوشـت هەڵوێستەیان لەسـەر هاونشینی کردووە.

ئـــــــــەهـــای ! دەگــــــــەڵ بــەدان کـــــەم دانیشی

چون نەفسی ئینسان خــو و خــدەی پــێــوە دەنـیـشی

کـــوڕی حــــــەزرەتـی نـــــــوح دەگــەڵ بــەدان ڕۆنیشت

خــــــــۆی و دۆستــــــــانی ســـەرە و خـــوون ڕۆیشت

سەگی ئەسحابی کەهف چەن ڕۆژێ هاودەمی چاکانی کرد

لــــــە پێڕی پیـــــــاوانی خــوادا، دانـــــیـــــــشت

************

**هونەر کانیەکی پڕ لە ئاوە و دەوڵەتی پایەدارە**

" زانایەك ئامۆژگاری کوڕەکانی دەکـرد, دەیگـوت ڕۆڵـەی بـابی! هونـەر فێر بن، دەوڵت و ماڵی دونیا جێی پشت پێ بەستن نیـە, زێـڕو گەوهـەر جێی مەترسین, یا دزو چەتە بە یەك جار دەیبـا، یـا خـاوەنی جیـا جیـا دەیخۆن. هونـەر کانیـەکی هەمیشە پـڕ لـە ئـاوەو دەوڵـەتێکی پایـەدارە, ئەگـەر هونەرمەنـد دەوڵـەت وەلانـێ، بـێ باکـە، چـونکە هونـەر بۆخـۆی دەوڵەتەو بۆ هەر جێیـەك بچێ قـەدری دەزانـرێ. لـە کـۆڕو مەجلیسـدا فـەرمووی سـەرێ دەکـرێ، بـەڵام مـرۆی بـێ هونـەر پـاروی بـێ سـەختی نابینێ، هەر پاروەو ناڕەحەتییەك دەبینێ.



ئەو وەختەی ئاژاوە کــەوتە شامێ

هــەرکەس هەڵاتە قــوژبن و لایێ

شــازادە ئــاقـــڵ مــەنــدەکــان

بــونــە وەزیـــــر و یــاری پـاشا

کــوڕە وەزیــرە کـــەم ئــاقڵەکان

بــوونە سـوالکـــەر لـە لادێکــان

" یەکێ لە زانا بەرزەکان دەرسی بە شازادەیەك دەگوت, زۆری لێیـدەدا، جارێکیـان کـوڕە لـە بـەر شـەکەتی و بـێ تاقـەتی شـکایەتی بـردە لای باوکی, کە کراسی لەسەر بەدەنی شین و مۆر هـەڵکرد, بـاوکی لـە تـاوان دڵی وێکهات، بانگی مامۆستای کرد و گوتی: کوڕی خـەڵکی تـر ئەزیـەت نادەی, هۆی چیە ئەو کارە هەر بە کوڕی مە، ڕەوا دەبینی؟ مـەلا گوتی: چونکە قسەی وورد و گفتوگۆی پەسـەند بـۆ هـەموو کـەس پێویستە، بەتایبـەت بـۆ پاشـاکان، گوفتـار و کـرداری شـازادەکان گـرینگن، دەبـێ قسـەو ئاکاریـان دروسـت بـێ، وەلـێ قسـە و کـرداری ئەوانیـدی هێنـدە بایەخدار نیە.

ئەگەر هەژارو کۆڵەوارێك هــەزار عەیبی لێ ڕوبـدا

دۆســتانی یـــەك لــە ســەدی پێی نـــــازانـن

بــــــەڵام پــاشـــایــەك هــــەڵـــە بنــوێنێ

هــەر زوو لەو هەرێم بۆ ئەو هەرێم بڵاوەی دەکا

**بۆ تەنەڵەکردنی ئەخلاقی گەوران پێویستە ماموستا:**

بـۆ شـازادەکـان هـەوڵی چـرتـر بـدا
تـا ئەوەی بۆ منـداڵانی گشـتی دەیـدا
هەر کەس بەمنـداڵی فێری ئەدەب نـەبێ
لـە گـەورەییدا سـەرکەوتـوو نابـێ
داری تـەڕ دابێنە چـۆنـت دەوێ
بەڵام داری ئیشك بـەبـێ ئـاور ڕاست نابێ

پاشا تەکبیرو وەڵامی جوانی مەلای پێخۆشبوو، هاوڕایی بۆ دەربڕی، خەڵاتی کردو بەخشش و پایەو پێگەشی بڵند کرد.

**گفتوگۆی دەوڵەمەند زادەیەك دەگەڵ کوڕە هەژارێکدا**

کوڕە دەوڵەمەنـدێکم بینـی لـە سـەر گـۆڕی بـابی دانیشتبوو، دەگـەڵ کـوڕە هـەژارێك دەمەتـەقێی بـوو، دەیگـوت سـندوقی گـۆڕی بـابم کێلـی ڕەنگـین و مەرمـەڕەو شـتی جـوانی لەسـەر نەخشـێنراوەو کاشـی گرانبەهای لە ژێر ڕاخراوە، خشتی زێڕی لـە بـن سـەری دانـراوە. گۆڕی باوکی تۆ چی بۆ کراوە، هەر دوو کێـل و خشـت و بـە مستە خـۆڵێکیش داپۆشراوە. کوڕە هەژار گوتی: هـەتا بابـت لـە ژێـر ئـەو هـەموو بـەردە گرانەدا دێتە دەرێ، باوکی من دەگاتە بەهەشتێ.

کـەر هـەتـا بـاری شـانـانی سوکتر بێ
بێ شك، لە کار و ڕۆیشتنێ ئاسودەتر دەبێ



فەقیر کە باری هەژاری ڕاکێشێ
کۆڵی سوکترە لە وەختی مردنێ

ئەوەی لە ژین ڕاحەتترە
حەتمەن مردنی بە ئازارترە

کوڕەکەی خۆی نسیحەت دەکرد باوکێ
ئەی جوان مەرد ئەو پەندەت لەبیرت بێ

هەر کەسێ دەگەڵ دۆستانی وەفای نەبێ
ئاقڵمەند و ڕووی دۆستیی نابێ

تا نەزانی قسەکەت بەجێیە مەیڵێ
ئەوەش کە خراپە بۆ وەڵام، مەیڵێ

************

معشـــوق هـــزار دوســـت را دل نـــدهـــی
ور مـــی دهـــی آن دل به جـــدایی بنهی

دڵ مـــەدە دڵداریّ کـــە هەزار یـــاری هەیـــە
خۆ گەر دڵیشت دایە بزانە کە هەر جودایی کۆتاییە

" لە بابی هەشتەم"

**بەشی هەشتەم: لەبارەی هاورێ و هاودەمی**

بەشی هەشتەمی گوڵستانێ داب و دەستوری هاونشینی و دۆستایەتیە. لەو بەشەدا بەکەمی چیرۆك دێنێ، لە حاڵێکدا لە بەشەکانی پێشوو بابەتە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیەکانی لە قاڵبی داستاندا شەنو کەو کردن، کە خوێنەر وێڕای بیستنیان پەندیشیان لێ هەڵدێنجێ، ئەهێنانی داستان لەو بەشەدا پەند و حیکمەتەکانی سەعدی زیاترە, چونکە ئەنجام و دەرەنجامی داستانێك، کە هەندێ جار پەرێك زیاتر دادەگرێت، لێرە لە دوو دێڕدا ڕوونی کردۆتەوە, لە جیاتی داستان و نمونە، لە یاسا و دەستوراتی ئەخلاقی کورت هەڵاتووە. زۆرێك لەو ڕستە و شێعرانەی کە بەشێوەی حیکمەت و پەندن، وتەکانی ئوستادی مەزن, کاریگەری تەواوی لەسەر فارسی زمانان دروستکردووەو ئەهلی کەماڵ بۆ پاڵپشتی قسەو مەبەستەکانی خۆیان, پشت بەو بەشە دەبەستن، بە چەشنێ پەخشان و بەیتی ڕەوانی میراتی ئەدەبی فارسی ناتوانێ وا دڵ داگرێ و جێ بگرێ.

**هێندێ لە وتە و شێعرەکان ڕادەگوێزم**

* ماڵ بۆ ئاسایش و خۆشی ژینە، نەك تەمەن و ژیان بۆ ماڵ خڕ کردنەوە.

* لە ئاقڵمەندێکیان پرسی خۆشبەخت کێیە؟ بەدبەختی چیە؟ گوتی: ئاقڵ کەسێکە خواردی و چاندی، بەدبەخت ئەوە کە مرد و بەجێی هێشت.

* دوو کەس ڕەنج و زەحمەتی بە خۆڕایی دەدەن، یەکیان خڕی کردەوە و نەیخوارد، ئەویدیان فێر بۆو کاری پێ نەکرد.

* وڵات بە زانایان دەڕازێتەوە و دین بە خودناسان بەرز دەبێتەوە.

هەتا زانست زۆرتر بزانی
کاری پێ نەکەی هەر نەزانی
نە پەی بە هیچ بردوە نە ئاقڵمەندە
چوار پێ کتێبی لێنێی هەرچەندە
ئەو بێ ئەقڵە کوا دەزانێ چی لێنراوە
باری کتێبانە یا بارە دارە هەڵبەستراوە

* سێ شت نامێننەوە: ماڵی بێ تیجارەت، زانستی بێ کۆڵینەوە، پادشای بێ سیاسەت.

* ئەو نهێنیەی دەگەڵ دۆستەکەتدا هەیە مەیدرکێنە, بە چ دەزانی کاتێکی تر نابێتە دوشمن.

* هەرچی پێتدەکرێ دەگەڵ دوشمندا مەیکە، ڕەنگە ڕۆژێك ببێتە دۆست.

* ئەو ڕازەی کە هەتە بۆ کەسی مەدرکێنە, هەرچەندە دۆستی گیانیش بێ, چونکە ئەویش دۆستی هەیە و هەروا ئەوانیش تا کۆتایی.

* خامۆشی باشترە لەوەی ڕازی دڵی خۆت بۆ کەسێ باس بکەی و بشڵێی دەنگێ مەکە.

* ساغ و سەلیم ئاوێ لە سەرچاوێ هەڵبەستە، جۆگەلە کە پڕ بوو بە کەس نابەسترێ.

* لە نێوان دوو دوشمندا وەهابێ، ئەگەر وەختێ بوون بە دۆست شەرمەزار نەبێ.

* شەڕ لە نێوان دوو کەس وەك ئاگرە، هەواڵدەری بەدبەخت داربەرە.

* لەوانەیە ئەو دووانە دڵیان بە یەك خۆشبێتەوە، شۆڤار لە نێو كوێر بەخت و خەجاڵەت دەمێنێتەوە.

* ئەوەی ئاگر لە نێو دوو كەس هەڵایسێنێ، نا ئەقڵانەیە و لەو نێوانە خۆی دەسوتێنێ.

* دەگەڵ دۆستان هێواش بدوێ، تا دوشمنی ئەگریس گوێی لێ نەبێ.

* لە بن دیواری ئەوەی دەیڵێی گوێت لێبێ، نەوەك لەو دیوی دیواری گوێ هەبێ.

* ڕق و توڕەیی لە ڕادە بەدەر ترس و هەراسانی دێنێ، لوتف و نەرمی بێ وەخت و جێی سام و هەیبەت ناهەڵێ.

* نە هێندە زبر و درشت بە، خەڵك لەبەرت هەڵێ، نە ئەوەندەش نەرمی، بەسەرتدا زاڵ بێ.

* زبری و نەرمی هەردووكیان پێكەوە چاكن، حەكیم خاوەنی نەشتەر و مەڵهەمیشە.

* ئاقڵمەندی زبر ناگاتە پیشەی خۆی، هەروەك قەدری خۆی نابا بەدەستی خۆی.



* لە خاکی بەڵخان گەیشتمە خوداپەرستێ، گوتم بە تەربیەت لە جەهل پاکم کەوە، فەرمووی: ئەی فەقێ تەحەمولت هەبێ وەك خاك، یا هەرچی خوێندوتە بیخە ژێر خاك.

* ئەگەر هەواڵێکی دڵ ئازاردەرت بیست، هاوار مەکە, تا یەکێکی تر باسی دەکا.

* ئەگەر حەکیمێك دەگەڵ نەفامێکدا کەوتە دەمەتەقێ، با بە تەمای حورمەت و ئەدەب نەبێ. خۆ ئەگەر نەفامێك بە زمان درێژی بەسەر ئاقڵمەندێکدا زاڵ بوو سەیر نیە، چونکە هەر بەردە گەوهەر دەشکێنێ.

* سەیر نیە ئەگەر بولبول هەناسەی بۆ نەدرێ، کە دەگەڵ قەلە ڕەشێ دە قەفەسێ بکرێ.

* بەردی ڕەق ئەگەریش گەوهەر و کاسەی زێڕ بشکێنێ، قیمەتی زێڕ ناشکێ و بەردیش هەر هیچ نایەنێ.

* میسك ئەوەیە بۆنی بێ و خۆت بۆنی بکەی، نەك عەتر فرۆش باس و وەسفی بکا.

* ئینسانی زانا وەك قتوی عەتار بێدەنگە، بەڵام نەزان وەك دەهۆڵ ناوبۆش و بەرز دەنگە.



* بە یەکێکیان گوت ئینسانی زانای بێ کردەوە لە چ دەچێت؟ گوتی وەك زەردەواڵە و هەنگی بێ هەنگوین.

* بە زەردەواڵەی بێ ڕەحم بڵێ، مادام هەنگوینت نیە پێوە مەدە.

* بە گومان و دوو دڵی دەرمان خواردن پێچەوانەی ڕێی دروست و ئاقڵ مەندانە، هەروەك ڕێی نەدیتە و نە شارەزایە بەبێ کاروان.

* پرسیان لە ئیمامی مورشید غەزالی فیلەسوف و عاریفی چەرخی پێنجەم خاوەنی ( ئیحیای عولومی دین و کیمیای سەعادەت..) چۆن گەیشتنە ئەو پلە و پایە بەرزە لە زانستدا؟ فەرمووی هەرچی نەمدەزانی لە پرسیندا شەرمم نەدەکرد.

* لە شەوی تاریك دۆستانی خودا، وەك ڕۆژی ڕوناك بۆیان هەڵدێ سەعادەت بە زۆری دەست و بازوو نیە، هەتا خودای میهرەبان نەیبەخشێ

* خودا دەبینێ و دەپۆشێ، بەڵام دراوسێ ناشبینێ و هەڵیدەماڵێ و دەیبزوێنێ.

* پەنا بە خودا ئەگەر خەڵك غەیب زان دەبوو، کەس لە دەستی کەس ئاسودە نەدەبوو.

**********



**زۆربەی وتار و وتەکانی سەعدی شاد و دڵ بزوێنن , خۆشی ئامێزن، تەڕ و پاراو و ناسك، دڵنشین، ئێمەش بەو دوو بەیتە شێعرەی خۆی کە کۆتایی بە گوڵستانێ هێناوە، لێرە چەپکە گوڵەکەی گوڵستان هەڵدەچنین و بە گەردنیەوە دەخەین:**

**ئێمە ئامۆژگاری خۆمان بەجێ گەیاند**
**ڕۆژگارێکمان تێیدا بەسەر برد**

**خۆ ئەگەر نەچووە بەر گوێی دڵی کەس**
**لە سەر پەیامبەران هەر گەیاندنە و بەس**

********

**بە ناوی خودای بەخشندەی بەدیهێنەری گیان**
**خودای کار بەجێ، وتەی خوڵقاندووە لە زمان**
**خوداوەندی بەخشندە و دەستگیر**
**سەخی و هەڵە بەخش، بیانوو قبوڵکار**
**خودای عەزیز، هەر کێ ڕوو لە بارەگای تۆ وەرگێڕێ**
**بۆ هەر دەرگایەك بڕوا هیچ حورمەتێکی چنگ ناکەوێ**

**"لە دیباچەی بۆستانێ"**



# بۆستانی سەعدی

یەکێك لە سێ شاکارە مەزنەکەی سەعدی، دوو بەیتیە ئەخلاقیەکەی کتێبی (بۆستان)ە, چەشنی دوو شاکارە بێ وێنەکەی تری، واتە ( گوڵستان و دیوانی غەزەلیاتی ) لە جۆری خۆیدا بێ هاوتایە و جەنابی سەعدی سەرمەشقی گەورە شاعیران و ئەدەبی فارسیە.

سەعدی هەروەك پێشتر باسمانکرد, دوای سەیر و سەفەری درێژ و جیهان گەڕی، دەگەڕێتەوە شیرازێ، بە هەموو ئەو زانست و ئەزمونە کامڵ و جیهان بینی و مرۆڤ ناسییەی ئەزمونی کردبوو، شاکارە ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیەکەی خۆی لە دوو بەیتی غەزەلی پڕ شەور و شەوق پێشکەش دەکات.

بۆستان لە ڕوی زمانەوە سادە و پاراوە، ئەوجی بەیان و ڕەوانیە، ئامانجی سەعدی دەرسی ژیانە. سەعدی بە پەخشان و شێعرەکەی وتەی فارسی دەگەیەنیتە بالأترین پلەی کەماڵ. لە قوتابخانەی سەعدیدا وتە و شێعری فارسی بە چاکترین وشە و داڕشتن جێی گرتووە.

وتەکانی سەعدی کورت و لەو پەڕی ئیعجازدایە، ئەهلی ئەدەب نێوەڕۆکی شاکارەکانی سەعدی لە ناو ئەدەبیاتی خۆیاندا ڕەنگ ڕێژ



دەکەن، هەروەك دەتوانن دەستەواژە و شێعرەکانی وی، لە ئەدەبیاتی خۆیاندا جێگیر بکەن، وتە و وتاری خۆیان چەشنی وی قەشەنگ بکەن.

سەعدی لە ساڵی ٦٥٥ ك واتە ساڵێك پێش گوڵستان، بۆستانی نوسیوە.

ز ششصد فزون بود پنجاه و پنج
که پُر دُر شد این نامبردار گنج

لە ساڵی ٦٥٥ کۆچیدا بوو گەنجینەی نێوداری بۆستان لە گەوهەر و مرواری پڕ بوو.

لە شێعری دوو بەیتی فارسیدا کۆمەڵە دوو بەیتیەك هەیە، کە لە ڕووی ناوەڕۆك و دەرەوەی شێعری لە مەسنەویە هاوشێوەکانیان باڵاترن، هەروەك زۆرێك لە دوو بەیتیەکانی شاعیرانی تر بە شوێنکەوتەیی ئەوان، شێعریان گووتوە، بۆ نمونە لە شێعری نازایەتیدا شوێنکەوتەیی شانامەی فیردەوسی کراوە, لە شێعری کۆمەلأیەتی و ئەخلاقیدا بۆستانی سەعدی، لە دوو بەیتی عیرفانی، مەسنەوی مەعنەوی مەولەوی، لەنێو دوو بەیتیە عاشقانیەکانیشدا خوسرەو و شیرین، لەیلیٰ و مەجنونی نیزامی.

هەرچەند نێوبانگی بنەڕەتی سەعدی لە غەزەلدایە و لە شێعری فارسیدا بە ئوستادی غەزەل هەژمارکراوە, بەلأم بۆستانەکەشی لە پلەیەکی باڵا دایە، کە پێی دەگوترێ ( سەعدی نامە ) لە زمانی فارسیدا نامە بە مانای کتێب دێ، واتە ( کتێبی سەعدی ), هەڵبەت ئەو نێوەش لە گرینگی بۆستان حیکایەت دەکرێ.





سەعدی لە بۆستاندا جیهانێك لە میهر، موحیبەت و مەردوم دۆستی، خزمەت بە مرۆڤایەتی بونیاد دەنێ، ئارەزووی بونیادی شارێکی ئارام، لێوڕێژ لە ئەوین. هەر ئەو شارە فەزیلەی کە ئەفلاتون خوازیاری بوو، بەداخەوە کە لە جیهاندا ئەزمون نەکراوە و نابینرێ.

سەعدی لە بۆستاندا خۆی بەرپا دەکات، سۆز و مرۆڤ دۆستی، خۆشەویستی لە جێی بەدی و شەڕ دۆستی دادەنێت. بۆستان بناغەی شار و ئاوەدانیە، خاوخێزانێکی تەندروست، دەرون و ڕۆحێکی پاك، ئەو باخەی هەموو ماڵ و شار و نیشتیمانێك پێویستیان بە سێبەری باخچەی بۆستان هەیە.

سەعدی جوانی شاری خۆی بە چیرۆکەکانی بۆستانێ لە دیوە ئەزمەریەکەی دەیگەیەنێتە باری کرداری. مەدینە فازیلەی فەلسەفی لە ڕاستیدا تەنێ وجودێکی زەینی هەیە، بەلام داستانەکانی بۆستان لە حەقیقەتدا زۆرێکیان خەسڵەتێك یا چەند دانەیەکی لە تاکێکدا هەیە، کەسێك هەیە خەسڵەتێك یان چەند خەسڵەتێکی تێدا بێت.

سەخاوەتی حاتەمی تایی، عەدالەتی ئەوشیروان، کە سەعدی داستانی لەسەر هێناوە، نمونەیەکن لە سیفەتە باشەکانی مەدینە فازیلە، هەرچەند تەواوی خەسڵەتە باشەکان لەیەك کەسدا نیە. بەلام لە هەر فەزیلەتێك، سەعدی بە هێنانی نمونە و چیرۆکێك، دروست بوونی مەدینەی فازیلە لەبەرچاوی خوێنەر بە گونجا و دەبینێ، ئاهومێدی بە هیوا دەگۆڕێ، تا هەر کەسێ بەلای کەمەوە بۆ خەسڵەتێك یان چەند خەسڵەتێك بۆ بیناکردنی مەدینە فازیلە تێبکۆشێ.

ئەگەر تەواوی ئینسانەکان نەشتوانن عادڵی ڕەها و سەخاوەتمەندی فیدا کاری، خۆ بەکەم زان و قەناعەتدار بن، بەلام کە لە یەکێ لە



سیفاتەکاندا کامڵ بێ، کۆمەڵگە دەبێتە ئەو مەدینە فازیلەی کە لە درێژایی زەماندا لە دەرەوەی بیر و زەینی ئینساندا نەبینراوە.

بەهەمان چەشن کە لە کۆمەڵگایەکدا یەکێك وەرزێر، یەکێ پیشەساز و یەکێك پزیشك، ئەوی دی ئەدیب، یەکێ دانیشتوی شار و یەکێك لە سەیر و سەفەرە، خۆ ئەگەر هەریەك لەوانە دروستکار بن, خزمەتکاری کۆمەڵگەن. لە مەدینە فازیلەی بۆستانێدا هەموو کەسێك بە خەسڵەتێکەوە وەسفدارە, ئەگەر هەر یەك لە تاکی کۆمەڵگە بە دڵسۆزی و خۆشەویستیەوە کاری خۆی ئەنجام بدات هەمان ئەو شارە بونیاد دەنرێ.

سەعدی لە تەواوی کەلەپوری شێعر و پەخشان و غەزەلیاتەکەیدا، کۆمەڵگایەکی کامڵ دەخوازێ و پێشنیار دەکات.

سەعدی کۆمەڵگە لە دونیای خەیاڵ تەسەور ناکا، نایەوێ تەنیا کۆمەڵگایەکی خەیاڵی نیشان بدا و لە خەیاڵدانەدا بیهێنێ و بیبا. سەعدی دەڕوانێتە ئەو کۆمەڵگایەی کە هەیە، بە جوانی و ناشیرینەکانی، بۆ هەردوو بەشە جوان و دزێوەکەی ڕێنمایی خۆی هەیە, دەکۆشێ هەر تاکێکی ئەو شار و کۆمەڵگایە دەستی خێر و ئاوەدانی هەبێ، هاندەری هەریەکەیانە لە جۆر و پیشەی خۆی.

سەعدی خڕبوونەوەی تەواوی خەسڵەتە پەسندەکان لە تاکێکدا تەوەقوع ناکات. بەڵام مەدینە فازیلەکەی ئەو هەنگینێ دێتە جێ، کە هەر کەسە و بە ئەندازەی توانا بۆ خزمەتی خەڵك و کۆمەڵگە تێبکۆشێ، خوداوەندیش بەدەر لە توانای خۆی تەکلیف ناکات (( لا یکلف الله نفسا الا وسعها )) بقرة ٢٨٦.



داستانەکانی بۆستانیٚ ئەو چیرۆکانەن کە هەبونیان لە ژیانی ئینسانەکاندا ڕودانیان گونجاوە. لە زۆرێك لە کتێبە ئەخلاقیەکاندا – عیرفانی کۆن- بۆ ئەوەی کاریگەری داستانەکانیان دوو چەندان بێت، نوسەران زێدەڕەوی و خەیالاتی قوڵ دەکاردێنن، بۆ ئەوەی پەند و ئامۆژگارییەکان زوتر بچنە دلأنەوە، داستانی خەیاڵی دەنەخشێنن.

شێعری ئەخلاقی و عیرفانی حەقیقەت و واقیعی ژیان ڕوون دەکەنەوە , خۆ ئەگەر گوتاری شاعیر و نوسەران لە مەرزی حەقیقەت تێپەڕیٚ ناتوانیٚ خوێنەران کەڵکی لیٚ هەڵکرێنن، داستانی ناواقیعی بۆ ژینی واقیعی دەست نادات.

بەڵام حیکایەتەکانی بۆستانیٚ لەو چیرۆکانەن کە زۆرینەیان لە ژیاندا بەر ئینسان دەکەون، ڕویانداوە و ناوێتەی ژینن. ئەگەر سەرانسەری بۆستانیٚ بگەڕێی خوێنەر باوەڕ بە ڕوداوەکان دێنیٚ، دەکریٚ ڕویان دابیٚ. پاشان دووبارە بوونەوەی ڕوداوەکان لە خوێنەردا نا مومکین نیە، هەستی دووبارەبونەوەیان لە خوێنەر و بیسەر دەخوڵقێنیٚ, بۆیە داستانەکان وەك پەند ئامێز وەردەگیرێن و زوو کار لە دلأن دەکەن.

سەعدی، تەنانەت چەشنیٚ داستانە نا ئاساییەکانیش باسدەکات کە خوێنەر بە ڕێگایەکی تر قبوڵی بکات. لە داستانە سۆفیەکاندا پتر ڕوداوی (خارق العادە – ئەو دیو کاری سروشتی و دەرەوەی سیستەمی ئاسایی) وەك بە هەوادا ڕۆیشتن، یا پیاسەکردن بەسەر ئاوێدا، لە زەمانی پێشوو زۆر گوتراوە، ئەگەرچی کەم لەو نمونانە دێنیٚ, هەر کاتێکیش لەو چیرۆکانە بگێڕێتەوە، تەئویلیان دەکات، مانای ئەو دیوی شتەکان نمایش دەکات.



بۆ نمونە لە چیرۆکێکدا وێڕای هێنانی کەلیمەی ( بیستن ) کە وەك ( بیستم ) لە سەرەتای زۆرێك لە چیرۆکەکانیدا دەستی پێکردووە، دەڵێ ئەگەر بیستمان لە ڕۆژگاری کۆندا بەرد لە دەستی بەندە تایبەتەکانی خوادا دەبوو بە سکەی زێڕ، واق وڕماو مەبە, چونکە وەختێ ئیمان و قەناعەتت هەبوو، بەرد و زێڕ لای تۆ یەکسانە. سەعدی مانایەکی تر بە بەرگی داستانەکە دەدا و دەڵێ: واتا ئینسانی بێ تەماح و بێ هەڵپە و نا چڵێس زێر و خاك لە بیر و دڵی ئەودا وەك یەکە.

" بیستومە لە ڕوزگاری کۆن، لە دەستی پیاوچاکاندا بەرد دەبوو بە زێڕ. فکر نەکەی ئەو قسەیە ماقوڵ نیە، گەر قەناعەتت هەبێ، زێڕ و بەرد لەلات یەکسانە. بڕوانە چونکە منداڵ دەرونی لە چنۆکی و تەماح پاکە، مشتێك زێڕ و مشتێك خاکی پێ وەك یەکە.

هونەری سادەی ڕەوان، واتە ئەو شێعر و وتە پڕ وێژە و بەرزەی کە هەموان تێی بگەن، بەلأم هەموو شاعیر و قسە زانێك ئەو ڕەوانییەی لە باراندا نیە، وەڵێ لە شێعری سەعدیدا شیرین بەهانی بە کەماڵی خۆی گەیشتووە، بە جۆرێ کە لە ئەدەبی فارسیدا وێنەی نیە.

ئەوەی لە قاڵبی قەسیدەدا دەگوترێ دیسان دشوارییەکی فراوانی هەیە, هەروەك لە قالبی مەسنەوی دوو بەیتیشدا دیسان گرفتی کەم نیە. ئەگەر بڕوانینە مەسنەوی مەولانای ڕۆمی دەیان شەرحی بۆ کراوە و دەکرێ، مەسنەوییە ئاشقانیەکەی نیزامی و خوسرەو و شیرینەکەی بەیتگەلێکی پێچاوپێچ و هالۆزی تێدایە. بەلأم بۆستانی سەعدی لە چەشنی خۆی بێ وێنەیە و لە ڕوانگەی شێعریش لە ئەوج و بالأ دایە, هێندە ئاسانە، هەرکەسێ شارەزاییەکی نێوەنجی لە زبان و ئەدەبی



فارسیدا هەبێ دەتوانێ لە بۆستانێ بەهرەمەند بێ و پڕ بە ئامێزێ گوڵ و لالە لەو باخچە ئاڵ و واڵە بچنێ.

سەعدی وێڕای سود وەرگرتن لە وشە و واژەی سادەی نێو شێعرەکانی، ئەوپەڕی تەڕ و پاراوی پاسا و ڕێسای زمانی فارسیشە، ئەگەر بمەوێ زۆرێک لە شێعرەکانی بە پەخشان دەربڕم، پێویست ناکا وشەکان بگۆڕمەوە.

زۆرینەی شاعیران لەبەر خاتری وەزن و قافیە جێی وشەکان ئاڵوگۆڕ دەکەن، بەڵام کەمترین گۆڕانکاری لە ڕستە بەندی لە شێعری سەعدیدا دەبینرێ.

بۆ ئەوەش چەند دێڕێک لە دەستپێکی بۆستانەکەیدا وەك بەڵگە دێنمەوە، خۆ ئەگەر بمەوێ بە پەخشان بینوسمەوە یا دەربڕم، ناتوانم جێ گۆڕکێ بە وشەکان بکەم.

بە نام خداوند بخشندە جان آفرین
حکیم سخن در زبان آفرین
خداوند بخشندە دستگیر
کریم خطابخش پوزش پذیر
عزیزی کە هر کە از درش سر بتافت
بە هر در کە شد هیچ عزت نیافت



به نـاوی خودای بــەخشنـدەی بــەدیهێنــەری گیـان
خـودای کـار بەجێ، وتــــەی خـــولّقـانـدووە لە زمان
خـوداوەنـــــدی بــــەخشنـــــــــدە و دەستـگـیـر
سەخـی و هـەڵـە بـەخـش، بیــــانوو قبوڵکـــــار
خودای عـــەزیز، هەر کێ ڕوو لە بارەگای تۆ وەرگێڕێ
بۆ هەر دەرگایەك بڕوا هیچ حورمەتێکی چنگ ناکەوێ

سەعدی لە دەستپێکی بۆستانێدا هۆی دانانەکەی شـەرح دەکـا، کـە دوای دیتنی دونیا و دەگەڵ هەموو جۆرە ئینسانێك دانیشتووە و هەسـتاوە و لە هـەر خـەرمانێ سـواڵەیەك خـڕ دەکاتـەوە. پاشـان دەڵێ: لـە غـەریبی شـار و وڵاتـان وەڕەز ببـووم، بـەرەو زێـد و وەتـەنی خـۆم گەڕامـەوە، بـە خـۆم دەگـوت خـەڵکی کـە لەسـەفەرێ دێنـەوە دیـاری و شـیرینی بـۆ ئاشنایان دێننەوە، ئەمنیش وەك هەر کەس لـە میسرێڕا دیـاریم پێیـە، قەندم بە دیاری هێناوە, بەڵام شـیرینی و شـەکری مـن قەنـدی کاغـەزە، ئەویش شێعر و غەزەلەکانن کە لە هەموو شەکرێك شیرینترن.

با پێکەوە شەکری فارسی لە دەم و زمانی سەعدی تامبکەین.

در اقصـــای عــــــــــالم بگشتــــــم بسی
بســـر بـــردم ایـــــــــــــــام با هر کسی
تمتع بـــه هر گـــــوشـــــــــــــهای یـافتـم
ز هـــر خرمنی، خــــــــــــــوشهای یـافتـم





چو پاکـــــان شیـــــراز خـــاکی نـــهـاد
ندیدم کـــــــــه رحمت بر این خاك باد
چو پاکـــــان شیـــــراز خـــاکی نـــهـاد
ندیدم کـــــــــه رحمت بر این خاك باد
تـــولای مـــــــردان ایـــــن پـــاك بـــوم
برانگیختم خـــــاطـــر از شـــــام و روم
دریـــغ آمـــــــدم زان همـــه بـوستـــان
تـهی دســـــت رفتـــن ســـــوی دوستـــان
به دل گفتـــم: از مصـــــر قنـــــد آورنـــد
بـــــر دوستــــــــان ارمغـــانی بـــرنـــد
مرا گر تهی بـــــــــــود از آن قنـــد دست
سخن هـای شیـــــریــــــــن تر از قند هست

لـــه دوور ولاَتـــــان گـــەڕان و گەشتم کرد
ڕۆژگارم دەگــــەڵ زانـــاو نـــەزان بە ڕێکرد

لـــە هـــەر فوزبنێك خـــۆشیم چنگ کـەوت
لەهەر خەلەو خەرمانێك شتێکم دەستکەوت

خـــاکی و چـــاکی چـــەشنی پـــاکانی شیرازێ
کەسم نـــەدی ڕەحمـــەت لـــە خـاکی شیرازی

خۆشـــــــەویستی خـــەڵکی پاکی شیـــرازێ
گـــەڕاندمیـــــەوە لـــــــە ڕۆم و شـــامێ



پێم حــەســرەت بــوو لــە باخ و بۆستان
دەست بــەتــاڵ بگــەڕێمــەوە لای دۆستان

بە دڵی خۆم گوت: لە میسرێ قەندی بێنم
بیکەمە دیاری بۆ دۆسـت و خۆشەویستــان

لێ، ئەگەر دەستیشم بــــە تاڵە لە شەکری
شێعر و وتـەیِ شیـرینـترم هێنـــاوە بۆتـان

...............................................

سـەعدی نـاوی دەرگاکـانی بـاخی بۆسـتانێ، یـا سـەعدی نامەکـەی خـۆی بەو شێوەیە دێنێ :-

دەرگای یەکەم / عەدالەت و ڕاو شورا

دەرگای دووەم / باسی ئیحسان

دەرگای سێیەم / باسی عیشق و مەست و پەشێوی

دەرگای چوارەم / باسی خاکی و تەوازوع

دەرگای پێنجەم / ڕازی بوون

دەرگای شەشەم / قەناعەت

دەرگای حەوتەم / پەروەردەو فێرکاری

دەرگای هەشتەم / سوپاسگوزاری ساغی و تەندروستی

دەرگای نۆیەم / تۆبەو ڕێی ڕاست و دروست

دەرگای دەیەم / موناجات و خەتمی بۆستان ئێمەش هێندێ لـە چیرۆك و ئامۆژگاری و حیکمەتەکانی بۆستانی سەعدی بۆ ئێرە ڕادەگوێزین.

**بەشی یەکەم: باسی عەدالەت و ڕاو شورا**

**بەشی یەکەمی بۆستان ئامۆژگاری و ڕێنمایی حوکمڕان و سوڵتانەکانە، تا لە کارو باری حکومەتدا ڕێوشوێنی دادگەری بکەنە پیشە.**

**رعیت چو بیخند و سلطـــان درخت**

**درخت ای پسر باشــد از بیـــخ سخت**

**مکـــن تا تـــوانی دل خـــلـق ریش**

**وگـــر می کنی مـی کنی بیخ خـــویش**

**خـــرابی و بـــدنامی آیـد ز جـــــور**

**بزرگـــان رســـند این ســخن را بفور**

**مپیچ ای پسر گـــردن از عقـــل و رای**

**کـــه مـــردم ز دستت نپیچند پـــای**

**بـــد و نیك مـــردم چـو بگـــــذرند**

**همـــان به کـه نـامت به نیکی برند**



پـاشـا قــەدی دارە و خـــەڵــکی ڕیشە
ئــەی کــورم دار ڕاوەســـتـاوە بــە ڕیشە
تا بۆت دەکرێ ئەزیەت مــەدە دڵی خەڵکی
بە ئازاری خەڵکی ڕیشەی خۆت لەبـن دێنی
بەد نـــاوی لــــە زوڵـــم پــەیـدا دەبێ
ئەهلی فیکر بە چاکی لەو وتە حاڵی دەبێ
ڕۆڵە ڕوو لە ئەقـڵ و ڕاویـــژ وەرنـەگێڕی
ئەگەر وابوویت کەس ڕووت لێ وەرناگێڕی
چاك و خراپ هـەر دەبـێ بڕۆن و نــامێنن
وا باشترە دوای خـۆت بە چاکە ناوت بێنن

سەعدی هـەر لـە هـەمان لاپـەڕەکانی دەستپێکی بۆستانێدا, ئامۆژگـاری کاربەدەســـتان دەکـــات لــــە ڕێزگرتنـــی ئــەو موســـافیرانەی کــە لــە کیشوەرەکانی تر ڕوو لە ولأت دەکەن، گەڕیدەکانیان خۆشـبوێن، چـونکە کاتێ دەچنەوە ولأتی خۆیـان باسـی کیشوەری ئێمـە دەکـەن و پێناسـەی دەکەن، ئەوەش وادەکا خەڵکی مەملەکەتەکانی دی ڕێز لە ئێمـە بنـێن و بە چاك باسمان بکرێ.

سەعدی چونکە بەشێکی گرینگی تەمـەنی لـە گـەڕان و سـەیر و سـەفەر بەسەر بردووە، بـە باشـی ئاگـای لـە کاریگـەری گەڕیـدەکان لـە وەسف و ستایشی شـار و ولأتـەکان هەیـە. لـە واقیعـدا ئـەوەی ئـەوڕۆ موسـافیرو




گەریدەکان ڕادەکێشێ، سەعدی حەوسەد ساڵ پێش ئێستا درکی کردووە و ڕێنمایی داوە.

**ڕێزی پیر و بە ساڵاچوان**

سەعدی، بە فەرمانڕەوایان دەڵێ، ڕێزی کەسانێك بگرن کە لە ڕۆژگارێکدا خزمەتیان کردووە و ئێستا لەبەر پیر و کەنەفتی دانیشتوون، پێویستە چاودێری بکرێن، قەدریان زیاتر لە ساڵانی گەنجی لەبەر چاو بگرێ.

قدیمان خود را بیفزای قدر
که هرگز نیاید ز پرورده غدر
چو خدمتگزاریت گردد کهن
حق سالیانش فرامش مکن
گر او را هرم دست خدمت ببست
تو را بر کرم همچنان دست هست

بە ساڵاچوانی خۆت ڕێزی زۆریان بۆ دانێ
چون ئەوەی پەروەردەی تۆیە بێ ئەمەك نابێ
ئەگەر خزمەتکارەکەت لە کار کەوێ
هەقی ساڵانی ڕابردوویت لە بیر نەچێ
ئەگەر لەبەر پیریان خزمەتکردن ناتوانێ
خۆ ئەتۆ کەرم و چاکەت لەدەستدا دەمێنێ



**دەگەڵ ژێر دەستان خۆشەویست ڕەفتار بن، نەك توند، دونیا هەر لە یەك ڕەوش و کەشدا نامێنێتەوە.**

**مها زور منـــدی مکـــن بـــا کهـان**

**که بر یك نمگ مـــی نمـــانـــد جهـــان**

**ســـر پنجـه نـــاتـــوان بـــر مپیـــچ**

**که گر دست یـــابـــد بـــر آیی بـــه هیـــچ**

**مبـر گـــفتمـت پـــای مــــردم رجـــای**

**کـه عـــاجز شـــوی گــــر درآیی ز پـــای**

**دل دوستـــــان جمـــع بهتـــر که گنـــج**

**خزینه تهی بـــه کـــه مــــردم بـــه رنج**

**دەسەڵاتدارادەگەڵ چینی خوارێ مەکە ملانێ**

**چوون دنیـا تـاسەر بـە یەك شێوە نـامێنێ**

**سەرپەنجـەی ئینسانی بێدەسەڵات نـەشكێنی**

**ڕۆژێ دەستی بـڕوا تۆڵەی خـۆی هەردەستێنی**

**وتم لە خشتە مەبەو هـەڵ مەدێرە خـەڵكی**

**چوون دامـاو دەمێنی ڕۆژێ کە لەكار کـەوتی**

**دڵـی دۆستان دڵنیابێ باشتـرە لە گـەنجینێ**

**خـەزێنـەی بـەتـاڵ چاتـرە لە ئەزیـەتدانێ**

**دونیا جاویدانی نیه**

جهان ای پســـــر ملك جـــاوید نیست

ز دنیـــــا وفـــاداری امید نیـــــــــست

نـــه بر بــــــاد رفتی سحـــــرگـــاه و شام

ســـریـــر ســـلیمان علـــــیه الســـلام

بـــه آخـــر ندیدی كه بـــــــــر باد رفت

خنك آنكه با دانـــــــــش و شـــاد رفت

كسی زین میـــــان گـــــوی دولت ربود

كه در بنـــــــــد آســـایـــش خلق بود

بـــه كار آمد آنهـــــــا كـــه بـــــر داشتند

نـــه گـــرد آوریـــــــدنـــــد و بگذاشتند



ئـەی کوڕم دنیـا سەروەتی جاویدان نیە
لـــە دنیا وەفـــاداری و جێی هومێد نیە
بەیانی و ئێواران تەختی سولەیمانی نەبی
بـــەهـۆی بـــاوە دەهات و دەڕۆیی
لـــە دواییدا ئـەتدی چۆن لەبەین چوو
وەك کـــای بـەر بـــای لێهات و چوو
ئـــەو کـەسە دەوڵەت و دنیای بردەوە
کە خەڵکی لـــە ژێر سایەیدا حەسایەوە
لە هەڵگراوە هەر چاکەیە بە کـەڵك دێ
نەك ئەوەی کۆی کردەوەو بە جێی دێڵێ
ئـەگەر کارێك بە ڕاوێژ ئـەنجام بدرێ
ئـەنجام و کۆتـاییەکی چـاکی دەبێ
خۆ نـابێ بـــە جەنگ یەکلایی وەبێ

*******

**بەشی دووەم: باسی چاکە**

سـەعدی لـەو بەشـەی بۆسـتانێدا ڕووی وتـاری لـە تـەواوی خەڵکیـە, هەسـتی چـاکەکاری لـەو پـەڕی کەماڵـدا ڕێنمـایی و دەسـتور دەدات. بـاوەڕی وایـە سـەعادەت و خۆشـبەختی دونیـا و دوارۆژ لـە چـاکە کاریدایە.

خــــدا بر آن بنده بخشایش اســـت
که خلق از وجودش در ئاسایش است

## خـــودا دەگەڵ ئەو کەسە بەخشندەیە
## کە خەڵکی لە دەستانی لـــە ئەمندایە

سەعدی هەر لە دەستپێکی باسی ئیحساندا تەواوی ورد و درشتی چاکە کاری وەبیر دێنێ و تـەنێ لـە لاپـەڕەی یەکـەمی ئـەو بەشـەدا ئامـاژە بـە چەندین خاڵ دەکا و پاشان لە چیرۆکەکاندا شـەرحی ڕەمـز و ڕازەکـانی ئیحسان دەکات.

با لە چەند بەیتێکی سەرەتای فەسڵی ئیحسان ڕامێنین:

کرا دانش و جـــــــود و تـــقـوی نبود
به صورت درش هـــــیچ معنـــــا نبود

کەسێ زانست و بەخشش و پەرهێزکاری نەبێ
شکڵی دەرێی بۆشـــە و هیچ مـــانـــای نـــابێ

ئارامی دوای مەرگ  ئارامی دانە بە ئەوانی تر:

کســـی خسبـــــد آســــوده در زیـــر گـل
که خسبند ازو مـــــــــردم آســــوده دل
غـــــــم خویش در زندگی خور که خویـش
بـــه مــرده نپـــــردازد از حـــــرص خویـش



کەسێ بە ئـارامـــی لە ژێر گــڵدا دەخــــەوێ

ئــەگەر خەڵکی لە دەست و زمانی ئاسوودە بنوێ

بــۆ دوارۆژی خـــۆت خـــەمـــــی خـــۆتـت بـێ

هـیــــوایـەکـت بـە میراتگرانی خــــۆت نــەبـێ

بەیتـە شـێعرەکانی تـر هەریـەکێکیان ئامۆژگارییـەکی سـەربەخۆیە، پەیوەندیان بە پێشوو پاشووی بابەتەکەوە هەیە.

نخــواهی کــــــــــه پــراکنده دل

پراکندگـان را ز خـــاطـــر مهـــل

پریشان کن امــروز گنجینه چیـــــست

که فردا کلیدش نــــه در دســــت تست

تــو بـــا خــود ببــر توشـه خویشتن

که شفقــت نیایــد ز فـــرزنـــد و زن

کســی گــوی دولـــــــت ز دنیـا بـرد

کـــــه با خود نصیبی به عقبی بـرد

به غمخوارگی چــون ســرانگشت مـن

نخارد کس انــدر جهـــان پشت مـن



ئەگەر دڵی پڕ لە خەم و پەراگەندەت ناوێ

دڵ پەرێشانان لــە بیر خۆت مــەبە دەرێ

پــەرش و بڵاو بکە گەنجینە و ببەخشە

چـون سبەی کلیلەکەی بەدەست تۆ نامێنێ

دەگـەڵ خۆت بەرە توێشوی ڕۆژی پەسڵانێ

چون بەزەیی لە ژن و منداڵ چاوەڕێ ناکرێ

کـەسێ لـە دنیـادا دەوڵـەت دەباتـەوە

کـە دەگەڵ خۆی بارێك بۆ قیامەتێ بەرێ

مشـورخۆر خۆتی، بە دەستی خـۆت نەبێ

خۆ کـەس پشتێ کـەس نـاخـورێـنێ

دوای چـەند ئامۆژگاریـەك، سـەعدی چـاودێری و دڵنـەوای منـداڵانی هەتیو لە پێش هەموو چاکەیەکدا یادی لێدەکات، بە گوتـەی خـۆی ئـەو بە منداڵی بابی لە دەست داوە و دەردی هـەتیوی بـە چـاکی هەست پێ کردووە:

مـرا باشـد از درد طـفلان خبـر

کــه در طفلی از ســر برفتم پـدر

ئەمن دەزانم دەردی هەتیوی چۆنــە

چون بە منداڵی بابی خۆم مردووە



پدر مرده را سایه بر سر فکن

غبارش بیفشان و خاکش بکن

ندانی چه بودش فرو مانده سخت

بود تازه بی بیخ هرگز درخت

چو بینی یتیمی سرافکنده پیش

مده بوسه بر روی فرزند خویش

یتیم ار بگرید که نازش خرد

و گر خشم گیرد که بارش برد

الا تا نگرید که عرش عظیم

بلرزد همی چون بگرید یتیم

برحمت بکن آبش از دیده پاك

به شفقت بیفشانش از چهره خاك

من آنگه سر تا جور داشتم

که سر در کنار پدر داشتم

اگر بر وجودم نشستی مگس

پریشان شدی خاطر چند کس

کنون گر بزندان برندم اسیر

نباشد کس از دوستانم نصیر

باب مردوو لە ژێر سایەی خـۆت وەحەسێنە

تەپ و تـۆز و خـۆڵی هــەتیوی لـێ بتـەکێنە

نــــــازانی ئـەو منـداڵــە چۆن دروستبووە

ئــــایە داری بێ بن تـــازە شین دەبێتەوە؟

گەر هەتیوێکت دی سەری وەرمزی شۆڕ کردووە

منداڵی خۆت لە لای وی ماچ مەکەو مەڕوسەوە

هــــەتیو ئــــەگەر بگریت کێ نــازی بکێشێ

خـۆ ئـەگەر گرووش بگرێ کێ باری هەڵدەگرێ

ئـاگاداربە هەتیو بگـری عەرشی خوا دەلەرزێ

بــە ســۆزەوە فــرمێسـکی چاوانـــی بسڕە

بـــە دلۆڤانی تۆزی بێ بابی لە ڕوخسار بسڕە

گـەر ئـەو منداڵە سێبەری بێ بابی لەسەر ئەما

ئــەتــۆ پەروەردەی بکـــە لــە سایەی خۆتدا

ئـــەو وەخـتــەی کـلاوی پاشاییم لەسەر بوو

کــە سـەرم لـــە ئــامێزو کۆشی باوکمدا بوو

خۆ ئــەگەر مێشولـەیەك لە سەر سەرم نیشتبا

لــە تـــاوێ مــن چـەنـد کەس دڵی دەپەرێشا

لێ، ئەوێستا ئـەگـەر بـۆ زیندانێشم بــەرن

هیچ کــەس لـــە دۆستــــانم نیانە خەمی من



داستانەکانی بۆستان چیرۆکی پەند ئامێز و پەیوەستن بە ژیان و ڕۆژگاری مرۆڤەکان، یەك لەو گرفتانەی خەڵکی کۆن هەستیان پێ کردووە، دووربونی هێندێ ماڵە لەو دوکانانەی کە پێداویستی ڕۆژانە دەفروشن، وەك دوکانی خۆراك و نانەوایی، کە هەموو ڕۆژێ خەڵکی نیازیان پێیە و دوکان و دوکانداری بەو شێوەیە بەردەست نیە، چونکە خەڵکی ئەوێ پێویستیان پێیە، کەسانێك لە جێگا دوورە دەست یا کەم ماڵەکان دوکانێ دادەنێن، هەرچەند لەبەر کەمی کڕیار شتومەکەکانیان دەمێنێتەوە.

سەعدی لەو چیرۆکەدا باس لەو کێشەیە دەکات. ڕۆژێکیان ژنێك بە هاوسەرەکەی دەڵێ لەو بەقاڵە نان و خۆراك مەکڕە، چونکە خواردن و شتومەکی خاوێن نیە و شتەکەی لەبەر چاوان نیە، مێردەکەی لە وەڵامدا دەڵێ ئەو دوکاندارە لەبەر ئێمە و ئەو کۆڵانە دوکانی داناوە، ئینساف و جوانمەردی ڕێ نادا شتی لێ نەکڕین و کار و کاسبی ڕاگرین.

بزارید وقت زنی پیش شوی

که دیگر مخزنان ز بقال کوی

ببازار گندم فروشان گرای

که این جو فروش ست و گندم نمای

نه از مشتری کاز زحام مگس

بیك هفته رویش ندیدست کس

بدلداری آن مرد صاحب نیاز

بـزن گفت کـــای روشـنـائی بسـاز
ره نیـــــک مـــردان آزاده گیـر
چـــو اســتاده دست افتـــاده گیر
ببخشــای کـانانکه مرد حـــق انـد
خـــــریدار دکـــان بی رونـق انـد
جوانمرد اگر راســت خواهی ولی است
کـــرم پیشه شـــاه مـردان علی ســت

واتا: ئافرەتێك بۆڵە بۆڵی لەسەر مێردەكەی دەكرد و دەیگوت، چیتر لە بەقاڵی گەڕەكێ نانی مەكڕە، بڕۆ بۆ بازاڕی گەنم فرۆشان، ئەو كابرایە جۆی هەیە نەك گەنم فرۆش، هێندەی مێش و مەگەس لێ دەنیشێ حەفتەی جارێكیش كەس ڕووی تێناكا.

بۆ دڵدانەوەی ژنەكەی پیاوی خاوەن نیاز گوتی:

ئەی چرای ماڵێ هنیات بكەو بسازێ، خوو خدەی پیاوی چاكان بگرە، ئەتۆ كە لەسەر پێی خۆتی دەستی پیاوی كەوتوو بگرە، چاوپۆشیت بێ، ئەوانەی مەردی هەقن، كڕیاری دوكانی بێ ڕەغبەتن، ئەگەر پیاوی جوامێری ڕاستت دەوێ، ئەوە حەزرەتی عەلی كەرەم پیشەی شای مەردانە.

چاكە كاری و دلۆڤانی لە ڕوانگەی سەعدی تەنێ لە خۆشەویستی ئینسان كورت هەڵنەهاتووە، بەڵكە ئاژەڵ و گیانـدارانی تریشی تێكەڵی ئەو چاكە كارییە دەكات، ئەوانیش گیاندارن و گیانی شیرینیش خۆشە.



**یەکێك لەو ئاژەڵانەی کە هەمیشە کراوەتە بەڵگەو نمونەی پیسی، سەگە، بەڵام سەعدی لە داستانێکدا باسی چاکە دەرهەقی سەگ قسە دەکات، ئەنجامی چاکە کاریش لە بەرانبەر سەگدا فەرامۆش نابێ، چاکە کردن لەنێوان ئاژەڵ و ئینساندا چ جیاوازییەکی هەیە ؟**

**یکی در بیابان سگی تشنه یافت**

**برون از رمق در حیاتش نیافت**

**کله دلو کرد آن پسندیده کیش**

**چو حبل اندران بسته دستار خویش**

**بخدمت میان بست و باز و گشاد**

**سگ ناتوان را دمی آب داد**

**خبر داد پیغمبر از حل مرد**

**که داوەر گناهان او عفو کرد**

**الا گر جفا کاری اندیشه کن**

**کرم پیشه گیر و وفا پیشه کن**

**کسی با سگی نیکوئی گم نکرد**

**کجا گم شود خیر با نیك مرد**

**یەکێ لە بیاباندا توشی سەگێکی تینوو بوو**

**کە هەناسەیەك نەبێ لە ژینیدا نەما بوو**

**ئەو دین پەسندە کڵاوەکەی خۆی کردە سەتڵە**



مەندیلەشی کـردە گوریس و ئــاوی پێ هەڵێنجا

بۆ خزمەتی ئەو سەگە پشتێنی پیــاوەتی گرێدا

سـەگی بێ چـــارەی تێر و تــەسەل ئـــاودا

پێغەمبەر هــەواڵی ئــەو کـەسەی ڕاگەیــاند

خـودای دادوەر لە گوناحی وی سەرفینەزەری کرد

ئــاگـاداربە نەکــەی جەفاکاری بکــەیە پیشە

خــوو بـە لـوتف بگرە و چـاکــە بکە پیشــە

کەسێ کـە دەگــەڵ ســەگــێ چـاکـــەی کـرد

خـــودای گــەورە چــاکــەی وی ون نــەکـرد

لـە چیرۆکێکی تـردا لـە مـەڕ خۆشەویستی و دڵـداری دەگـەڵ ئـاژەڵ و گیاندارانـدا، چیرۆکێك لـە شیبلی عـاریفی نێـوداری چەرخی سێیەم و چـوارەمی کۆچـی دێنێتــەوە. ڕۆژێکیــان تورەکـە گـەنمێك دەکـڕێ و بردیــەوە دێکــەی خــۆی، کـاتێ تورەکــەی کــردەوە مێرولەیــەکی سـەرگەردانی بینـی، دڵـی پێ سوتا، هـەڵیگرت و بردیـەوە جـێ و مـاڵی خۆی.

ﻧ

یکـــی ســیرت نیکــمردان شنو

اگـــــر نیکمردی و پــاکیزە رو

کـــە شبلی ز حانوت گندم فـروش

بـــدە بـــر دانبان گـندم بـدوش

نگـــــه کرد مـــوری در غله دیـد

که سر گشته از هرطرف می دوید

ز رحمـــت برو شب نیـارست خفت

بما وای خـود بـــازش آورد و گفت

مروت نبـــاشد کـــــه این موریش

پراگنده گردانم از جـــای خویش

درون پـــــراگندگـــــــان جمع دار

کـــــــه جمعیتت باشد از روزگـــار

******

گوێ بگره بۆ باسی پیـاو چاکان

گەر یەکێکی لە چـاك و ڕوو پاکان

شیبلی هەمبانــە گــەنمێکی کــڕی

بە کۆڵ بردیەوە ڕێی زۆری بـڕی

هەنبانەی ڕشت و مێروله دەبینێ

سەرگەردانە بۆ ئەو لاو لا هەڵدێ

لەتاوان شــــەوێ نــەیتوانی بخوێ

بەیانی مێروەکەی بــردەوە و وتی

لەزێدی پەراگەنـدەی کەم ناپیاویە

دڵی بلاّوان کۆ کەوەو ئاگات لێ بێ

خاترجەم خەڵك لە دەورەت دەبێ



له چیرۆکی سێیەمی باسی میهرو لوتف به ئاژەڵ و گیانداران، سەعدی وێڕای بەخشندەیی و مەرحەمەت دەگەڵ هەر گیاندارێك، ئەو خاڵەشمان دێنێتەوه یاد کە تەنێ ئینسان بەندەی چاکەو لوتف نیە، ئاژەڵانیش لوتف و موحیبەت هەست پێ دەکەن. لەو بارەوه چیرۆکێك له گەنجێك دێنێتەوه کە ڕێشمەی له گەردنی مەڕێك کردبوو بە دوای خۆیدا ڕایدەکێشا، پێم گوت: بە هۆی ئەو گوریسەیە کە مەڕەکەت بەدواوەیە, کابرای لاو ڕیشمەی لە ملی کردەوە، بە چەپ و ڕاستدا ڕایدەکردو مەڕیش بە هەمان شێوە چەپ و ڕاستی دەگەڵ دەکرد، وەختێ هاتەوە گوتی: دیتت چۆن مەڕەکە بەبێ گوریسیش بەدوامدا ڕایدەکرد, ئەوە پەتی چاکەو خۆشەویستی بوو بە دوا منیدا دێناو دەبرد.

به ره در یکی پیشم آمد جوان
بتك در پیش گوسفندی دوان
بدو گفتم این ریسمان ست و بند
که می آرد اندر پیت گوسفند
سبك گوق و زنجیر ازو باز کرد
چپ و راست پوئیدن آغز کرد
به ره همچنان در پیش می دوید
که جو خورده بود از کف مرد خوید
چو باز آمد از عیش و بازی بجای
مرا دید و گفت ای خداوند رای



**نه این ریسمـان مـــی برد با منش**

**که احســان کمنــدیست در گـردنـش**

**واتا: له ڕێگایـەك توشی گـەنجێك بـووم، مـەڕێکی بـه ڕاکـردن بـه دواوه ببوو، گوتم: ئەوه گوریسەکەیه ڕایدەکێشێ، وه گەرنا به دواتدا نایێ، گورج گوریسی له ملی کردەوه و به چەپ و ڕاست ڕایکـرد، مـەڕیش بـه دوایدا ڕایدەکرد، چونکه له دەستی ئـەو گەنجـه جـۆی خواردبـوو، کـاتێ له یاری و گاڵتـه گەڕایـەوه منـی بینـی و گوتی ئـەی خـاوەن ڕاو بـیر، وا مەزانه که ئەو گوریسه به دوا منیـدا ڕادەکێشا، ئـەوه چـاکه کـاری بـوو ببوه کەمەندێك له گەردنیدا و ڕایدەکێشا.**

**هـەر لـەو بەشـەدا، سـەعدی چـەند چیرۆکێکی تـر دێـنێ، کـه نمونـەی والاو بالای بەخشندەگیی بـه حاتـەمی تـایی تایبـەت کـردووه، کـه نـاوی حــاتم نمونـــەی بەخشــین و ســەخاوەته، بــۆ ئــەوەی خوێنــەران لــه خوێندنـــەوەی دەســـتکراوەیی ئــەودا، کـــەرەمیان بچـــێته دڵــەوه و بەهرەوەربن. بەخشـندەیی و دەسـت والایـی حاتـەمی تـایی بـه چەشـنێ بووەتــه نمونــەی ســەر زاران کــه دەســتەواژەی ( حاتــەم بەخشــی ) لــه زمانی فارسیدا بووەته بالاترین مانای ئیحسان.**

**یەکێك لەو چیرۆکانەی پێوەند به حاتەم کـه لـه بۆسـتانێدا هێناویـەتی بەو شێوەیه:**

**" پیرەمێردێـك بـڕێ قەنـدی لـه کارگـەی حاتـەم خواسـت، حاتـەم بـاره شـەکرێکی بـۆ نـارد، خێزانـی حاتـەم دەم و لـوتی تێکنـان و گـوتی: ئـەو پیره پیاوه تۆزه شەکرێکی داوا کـرد، بۆچـی خـەرواره شـەکرێکت دایـه؟**




حاتەم گوتی: ئەو بە ئەندازەی پێویستی خۆی داوایکرد, ئەمنیش بەقەدەر سەخاوەتی خۆم پێم بەخشی.

هاتە لای حاتەمی تایی کابرای پیرە مێرد
داوای کێشی دە درەم شەکری کرد
حاتەم بارە شەکرێکی بۆ بەرێکرد
خێزانەکەی گوتی ئەوە چتکرد
خۆ کێشی ئەو دە درەمەی بەس بوو
ناوداری تەی کە ئەو قسەیەی گوێ لێ بوو
پێکەنی و گوتی: هەی دلآرامی من
گەر ئەو بەقەد پێویستی خۆی داوای کرد
لێ جوامێری ئالی تەی لە کوێدایە ؟

****

**بەشی سێیەم: باسی عیشق و شەیدایی**

سەعدی لەو بەشەدا لە عیشق و خۆشەویستی دەدوێ, کە بەشێکە لە واقیعی ژیان. لەو بارەیەوە داستان گەلێك دێنێتەوە.
ئەڵبەتە عیشق بۆ زاهیری و عیرفانی دابەش کراوە. عاریفان بڕوایان وایە عیشقی مەجازی پلیکانێکە بۆ گەیشتن بە عیشقی مەعنەوی. هەر بۆیە لە کتێبەکانی هەڵبەست و پەخشانی عیرفانیدا لە هەردوو جۆرەکە داستان هاتووە، لە دیدی عاریفاندا دەگونجێ عیشقی مەجازی بە عیشقی حەقیقی و مەعنەوی بگۆڕدرێ، یان ئیحساسی



عیشق بناغە و گرنگترین ڕێگایە، پەیژمیەکە بۆ گەیشتن بە مەعریفە و عیرفان.

سەعدی لە بۆستان و گوڵستانیشدا قسە لە عیشقی ئینسانی دەکات, هەروەك غەزەلیاتی سەعدی عاشقانە ترین شێعری زمانی فارسیە و لە تەواوی میرات و کەلەپوری خۆیدا لە هەردوو جۆری عیشقی مەجازی و حەقیقی قسەی کردووە و نەزەری خۆی هەیە، گاهێ عیشقی مەجازی لە پێشێ دادەنێ تاوەکو ببێتە پەیژمیەك بۆ عیشقی مەعنەوی، گاهێ هەر لە دەستپێکی بەشی عیشقدا، عیشقی عیرفانی کردۆتە سەر لەوحە و بناغەی ئەو بەشە.

خوشـــــا وقت شوریدگـــان غمش

کـه گـــر ریش بینند و گـــر مرهمش

گـدایانی از پـــــادشـــــاهی نـــور

بــا میدش انـــــــدر گـلدانی صبور

دمـــــــادم شـــــراب الم کش‌لنـــد

و گـــــــــر تلخ بیند دم در کشنـــد

بلائی خمـــــــار است در عیش مل

سلحدار خـــــــارست با شاخه گل

نه تلخ است صبری کـــه در یاد اوست

که تلخی شکر بـــاشد از دســت دوست

ملامت کشـــــــانند مستان یـار

سبکتر برد اشـــــــتـر مست بـار



واتا: چەندە خۆشە وەختی عاریفان و ئەویندارانی خودا کە خەم و پەژارەیان لەو ڕێیەدا فەرقی نیە، ڕەنج و خەم ببینن یا زامی تاسەیان بۆ هەتوان بکرێ، عاشقانی خودا بە هومێدی گەیشتن بە خودا لە گەدایی سەبرو ئارامگرن، دەم نا دەم شەڕابی مەعنەوی دەنۆشن ئەگەر تاڵترە، بەلأم وەنەبێ تاڵی سەبر ناخۆشبێ چونکە شتی تاڵ و تفت لە دەم دۆستانی خودا وەك شەکر وایە عاریفان ناترسن لە لۆمەی لۆمەکاران.

دوای چەند بەیتێك سەعدی عیشقی مەجازی و حەقیقی دەگەڵ عاشقانی ئینسانی و دڵدارانی مەعریفەت بەرانبەر یەك ڕۆ دەنێ و عیشقی عیرفانی پەسەندتر هەڵدەگرێ.

ترا عشق همچون خودی ز آب و گل
رباید صبر و آرام دل
که پنداریش فتنه بر خد و خال
بخواب اندرش پای بند خیال
بصدقش چنان سر نهی بر قدم
که بینی جهان با وجودش عدم
نه اندیشه از کس که رسوا شوی
نه قوت که یك دم شکیبا شوی



ئاشقی چەشنی خۆتی کە لە ئاوو گڵ دروستکراوە

سوکنایی و ئۆقرە لە دڵت دەبڕێنێ و بڕاوە

پێتوایە شەیدای خەت و خاڵی وی

لە خەون و خەیاڵیشدا هەر بەندی وی

وەها سەر لەبەر پێی دادەنێی و ئەستۆت کەچە

باوەڕت وایە تێکڕای جیهان بەرانبەر وی هیچە

لە ڕیسوا بوون باکت بەکەس نیە

دەمێ بێ وی ناتوانی سەبرت بێ و خۆڕاگریت نیە

سەعدی لە دەستپێکی ئەو بەشەدا بەچەند بەیتێکی دیاریکراو کە لە سی و شەش دێڕ تێناپەڕێ, شەن و کەوی عیشقی مەجازی و حەقیقی دەکات، ئەرزشی عیشق و شەیدایی لە سەرەتای ئەو بەشەدا بە باشترین گوزارشت بەیان دەکات.

لە ڕاستیدا لە باتی ئەوەی هەمان دەرەنجامی هەردوو عیشقەکە بۆ پایانی بەشەکە هەلگرێ, لێ هەر لە دەستپێك بەرەنجامەکە دەدرکێنێ.

بە ڕای سەعدی عیشقی خوڵق و خۆی ئەوانیدی ئەرزشترە لە عیشقی وێنە و سیما.

" دەگێڕنەوە کە سوڵتان محمودی غەزنەوی خۆشەویستی و ئولفەتێکی زۆری بە غولامەکەی خۆی (ئەیاز —هەیاس)وە گرتبوو, دارو دەستە ئێرەییان بە دۆستایەتی و خۆشەویستی نێوانیان دەبرد, وێڕای بەد گۆیی هەیاس، بەدوای هۆی ئەو پەیوەندیەی نێوانی سوڵتان و ئەویشدا






دەگەڕان. مەحمودی غەزنەوی لە بەرانبەر ئەو بەدگۆییەدا، ڕۆژێکیان سوڵتان دەگەڵ دەست و پێوەند چوونە ڕاوو شکار، دەستوریدا باولی زێڕو گەوهەر دەگەڵ خۆیان بێنن، لە ڕێگا بە ئەنقەست فەرمانیکرد باولیەکە لەسەر وەڵاخی بەردەنەوە تا زێڕو زەنبەرەکە پەرش و بڵاو بێت، ئینجا گوتی: هەر کەسێ زێڕو گەوهەرەکان خڕ کاتەوە ماڵی خۆی بێت، تەواوی دەوروپشتی بۆ زێڕ و زەنبەر بە دەشتێ وەربوون، تەنیا هەیاس لە دەوری سوڵتان مایەوە.

مەحمودی غەزنەوی لێی پرسی ئەتۆ بۆچی نەرۆیشتی؟ گوتی قوربان ئەمن سوڵتانم هەیە زێڕو زەمبەرم بۆچیە؟ لێرەوە خۆشەویستی هەیاسیان بە چاوی خۆیان دیت. ئنجا سەعدی لە دەرەنجامی حیکایەتەکەدا دەڵێ پێویستە هەر خودا خۆی، لە خودا بخوازی.

پێچەوانەی تەریقەتە دۆستانی خودا
بێجگە لە خودا خۆی بخوازن لە خودا
ئەگەر لە دۆستەکەت چاوەڕێی خێر و بێری
هەر لە خەمی خۆتدای نەك دۆست خۆی
هەتا زارت کراوەبێ بۆ تەماحی دنیا
لە پەنهان ڕازی خودایی بە گوێی دڵ ناگا
چونکە حەقیقەت کۆشکێکی ڕازاوەیە
تەپ و تۆزی هەواو ئارەزوو دایپۆشیوە
ئەو جێیەی تۆزی لێ بڵند بێ
چاو تیژیش ئەو شوێنە نابینێ



## شەمع و پەروانە

لە وەسفی دڵبەران، ئەهلی شێعر و ئەدەب، پەروانە بۆ عاشقی گیان بەخت، بە نمونە دێننەوە، کە لە عیشقی مەعشوقدا پەڕ و باڵی خۆی لە ئاور دەدا و خۆی دەسوتێنێ، مۆمیش وەك مەعشوقە.

سەعدی لە دوو چیرۆکی پڕ وێژەدا لە پایانی بەشی سێیەم دەربارەی عیشق و شەیدایی دەدوێ.

لە حیکایەتی یەکەمدا پەروانە وەك وێنەی ئاشقی ڕاستگۆ وەسف دەکات کە تا دەرچونی گیانی لە ڕێی عیشقدا خۆی دەکاتە قوربانی. لە حیکایەتی دووەمیشدا قسە لە بەردەوامی سوتانی شەمع دەکات، دەسوتێ، دەسوتێ تا دەبێتە تۆز و خۆڵ، لێرە مەعشوق بالاتر لە عاشق دەبینێ.

لە هەردوو ئەو چیرۆکەدا کە تەوەری ماجەراکە عیشقە، سەعدی بە جوانترین بەیان ماجەرای بێ پایانی عیشق و شەیدایی بە کۆتا دێنێ، بە چەشنێ کە چێژی شەرحی بێ وێنەی سەعدی هەمیشە لە ڕاز و نیازی گیانی خوێنەردا باقی دەمێنێ.

## داستانی یەکەم[11]

یەکێ بـــە پەپولـەی سـوتـــاو و کـــرِوزاوی گـــــوت

دۆستێکی پـــەیـدا بـــــکە لایـــق بـــــە خــــــۆت

بـــە رێگـــایـەکـــدا بـــــــرِۆ هیـــوا و هومێـد ببینی

نــــــــەتۆ و میهری مـــۆم لـــــە کوێ، زۆرە بـەینی

پەپولەی سەمەندەر[12]نی، بە دەوری ئاوردا هەڵمەسورِێ

شـەمشەمە کوێرە خـــــــــۆی دەشێریتەوە لــە رِۆژێ

ئـــەگـــەر بزانی یـەکێك سورا و سور دوشـمـنـی تۆیە

بیـــکەیـــە دۆستی خــــــۆت نــــــا ئـــــاقـلانـەیـــە

پـــــــــەپولێ، کـــەس پێت ناڵێ کارێکی چـاك دەکـەی

گـیـانی خـــــۆت فیدای سەر و سـەودای ئـــەو دەکـەی

ســوالکەرێك خوازبـێـنـــی کـــچێ پـــــــاشــــای کرد

لـــە بـــاتی کـــــــــــچ، مســـت و شـەقی وەرگـــــرت

---

[11]. کسی گفت پروانه را کای حقیر

برو دوستی در خور خویش گیر
رهی رو که بینی طریق رجا

تو و مهر شمع از کجا تا کجا؟

بەهۆی درێژی دەستانە شێعریەکە، تەواوی شێعرەکانمان پێ نەگوێزت، تەنێ ماناکەمان هێنا.

[12]. ئەو زیندەوەرەی دەڵێن لە ئاوردا ئاسوێنی.



ئـــــەی پـەپولـە کوا دۆستـایەتی ئێوە ومردەگـری
ئـــاور قیبلەی پاشایانە هەقیـەتی تۆ بە یـار نەگریٚ
وا فکـر مـــەکە، کـە ئـەو لـە کۆڕی شـاهـانەی ئـاوا
کوا دەگـــــەڵ هـــەزارێـــکی وەك تـــۆ دەکا مـودارا
ئەگەر دەگەڵ تەواوی خەڵکی نـــەرم بێ و نەسوتێنێ
دەگەڵ تۆی بێچارە گەرمیێ دەکا و بێ شك دەتسوتێنێ
تـــەماشاکە بـــزانـــە پەپولەی هـەڵفرچا و چی گوت
عەجەبا ڕازیم گەر لە عیشقیدا پەڕوباڵیشم هەڵبڕوزێ
وەك حەزرەتی برایم ئاوری ئەوینـم دە دڵدایە ئـەمن
ئـــەو بڵێسەی کە دەیبینی ئـــاور نیە، گـوڵە بۆ مـن
وەنـــەبـــێ دڵ داوێـنـــی دڵستـــــان ڕاکێـــشێ
هـــــۆگـــــری و میهرەکــــەی، گیـــان ڕا دەکێـشێ
وەنـــەبێ بـــۆ خــــۆم ئــــاور بـەردەمە خــــــۆم
ئـــــــەوا زنـجـیـــری شـــەوقـــە دراوە لـە مــلـم
هـێـــنــدە دوور بـــــــــــووم سـوتـــانـــــدمی
وەنـەبێ ئـەو دەمی گـڕی دام و بە جارێ سوتـانـدیمی
ئەوە کێیە تـانەم تێدەگرێ لـەسەر دۆستایەتی یـارم
وەختێ کــە بـــۆخـــۆم ڕازیـم لـــە بن پێیدا بمرم
دەزانی تەمـاحی هـــیـــلاکی خـــۆم لــەبـــەر چییە
مـــادام ئـــەو هـــەیە، منیش نـــەبـم هـەر ڕەوایـــە

یاری پەسندم ئەوە، با بسوتێم
تاوەکو سۆزی دۆست کاری تێبکات
هەتا کەی پێم دەڵێی واوە بڕۆ
یارێکی هاو دەردی خۆت پەیدا بکە
بڕوانە ئامۆژگاری ئەو پەپولەی پەرێشانحاڵە
وەك ئەوە وایە دوپشکت پێوەدا و بڵێی مەناڵە
هەی هاوار یەکێ مەکە ئامۆژگاری
کە سوور دەزانی گوێ ناگری
بێچارەیەك لغاوی ئەسپەکەی بە دەستەوە نەمابێ
پێی ناڵێن ئەی جەوان بە ئەسپایی بڕۆ لە ڕێ
چەندە خۆشی گوتووە لە کتێبی سند باد[١٣]، هەیە
ئەی کورم ئەوین ئاگرە و پەندیش وەك بایە
ئاگر بە با خۆشتر دەبێ
پلنگ بە لێدان قەڵستر دەبێ
چون بە کەسی چاکم بینی، خەراپەم دەگەڵ دەکەی؟
کە ئەتۆ ڕووم پێ لە کەسێکی وەك خۆم دەکەی
پێی گوت: لە خۆت باشتر پەیدا بکە و بە هەڵی بزانە
کە تۆ دەگەڵ چەشنی خۆتی ون دەکەی ڕێی زەمانە

[٣]. ناوی کتێبێکە، حەکیمێکی هیندی نوسیویەتی و وێنەی کلیلەو دیمنەیە.



خۆ ویستان بە دوای کـــــەسێکی وەك خۆیـــانـدا دەڕۆن

بـــــە کـۆلآنی مەتـــــرسی ســـەرخۆشـــانـــدا دەڕۆن

من لـــــــە هەوەڵـــەوە هـــــــەوای ئەوەم دە سەردا بوو

بـــــە یەکجـــاری دەستم لـــــە سەری خۆم هەلگرت بوو

با سەری خۆی لە ڕێی ئەویندارییی دانێ، گەر ئاشقی ڕاستە

خۆ هەر پیاوی ترسنۆکـە ئـاشق بە خۆیەتی و خۆ پەرستە

ئـەجەل کـــە هـات لــــــە بـۆسـەیـــەکـدا دەمکوژێ

کـەوابـــێ وا چـــــــاکە ئـــەو یـاری نازەنینم بمکوژێ

چــــــــــارەنووس نوسیویـــەتـــی ڕۆژی ئــەمــــــــانم

جـــــا وا بـــاشترە بـــــە دەستـی دلآرامم ئـــەمێنم

خـــــــۆ ڕۆژێ هـەر دەبێ بە نـاچاری گیـان بێتە دەرێ

مـــــادام باشتر وایـــە لە پێناو دڵبەردا گیان بێتە دەرێ





## گفتوگۆی دووەمی مۆم و پەروانە[14]

لـەبیرمە شەوێك چـــاوم نـــەچونە خەوێ
بـیستم پـــەپولە دەگـــــەڵ مۆم دەدوێ
دەیـــگوت من عاشقم گـــــەر بسوتێم ڕەوایە
بــــەڵام گریان و سوتـــــانی تۆ لەبەر چیدایە
گـــــوتی: هـــــەی هەواداری مسکینی من
لـــــەلام ڕۆیی هەنـــــگوینی یاری شیرینی من
کـــاتێ شیرنی لــــــــە مـــن دوور دەکەوێ
وەکـــــو فەرهـــــــاد نـــاورم تێ بەردەبێ
مـــــۆم دەیـگـــــوت و سێلاوی ژانـــــێ
لــە هـــەر دوو چـــــاوانـی دەهـاتە خـــوارێ
دەیـــــگوت بـــزانە ئـــەوین کـــــاری تـۆ نیە
لەبەرانبەری ئەویندا نــە مانەوەو نە سـەبـرت هەیە
پـــەپولـەی کـــاڵ ئەتـــۆ لەبەر مەشخەڵێك هـەڵدێی
ئـــــەمن هەتــــا دەسوتێم ڕاوەستـــــاوم
ئەگەر ئاگری ڤین پـــەڕ و باڵی تۆی سوتـــــاندوە

---

[14]. شبی یاد دارم که چشمم نخفت
شنیدم که پروانه با شمع گفت
که من عاشقم گر بسوزم رواست
تو را گریه و سوز باری چراست؟



بـــــــــڕوانە مـــن ســەر تـــــــا پێم سوتــــــاوە

وێستا شتێك لـــــــــــــــە شــەوی نـــە ڕۆیشتــووە

لە نەکاو پەری ڕوخساریێ فــوی لێکرد و کــوژاندیەوە

مـــــــــۆم دەیگــوت و دوکـــەڵیشی لێ هــەڵدەستا

کـــە بە ئاوری یار بسوتێی شـــادیت دەستــدەکــەوێ

مــەگـری لــــــە ســــەر ئەو گۆڕەی کوژراوی دۆستە

بـڕۆ خــۆشی دەربـــــــڕە کــــە جێی قبوڵی دۆستە

ئـەگەر ئاشقی سەری خۆت لە دەردو نـــەخــۆشی مەشۆ

وەك سـەعـدی بـــە، دەست لــە هەمـــوو شتێك وەشــۆ

ئــەوی قــوربـــانی یـــارە لــە نیـــازی دەستهەڵناگـریێ

ئــــــەگەر تیرو بــــەردیشی بـــــە ســــەردا ببـاریێ

پێم گــوتــی ئـــامـــان، مـــەچــــۆ نـــاو دەریـــاوە

ئەگەر دەشچی خـــۆت بسپێـــرە بە شەپۆلی زەریـــــاوە

تینووی ئەڤینی یار ورد ورد دەڕۆیی و گیانی دەسپاریێ

خۆش بەحاڵی ئـەوەی لـــە ئـــــــاوی عیشقدا دەخنکێ

جەوانێك پێی گوت: سەیـــرە بـــۆچی خۆت دەخنکێنی؟

فەرقی چیە لێوت وشك بـــن یـــا تـــەڕ کـــــە مـردی ؟

دڵـدار جوابی دا: ئەوەنیە زارم دەکـەم تەڕ لە کۆتایی

هەتـــا دواجـار گیانی شیرینم فیدا و دەیکەمە قوربانی

دڵدار حەزدەکا لە ئەستێرەی پـــڕ ئاوی عیشقدا بخنکێ

تـــاكــو بــــــه نـاوی عیشق تێراو و شـــەهیـد بــێ
ئەگەر دڵداری بــه ڕاستی، داوێنــی یـــــــارت بگــره
خۆ ئـــەگـــەر گــوتی گیـانم بـــدەیه، بڵێ ها بیگره

*************

هــــەنـگـینـێ دەخـــۆی مــیـوەی بـەهـەشـتـێ
كــه پـــــەڕیـتــەوە بـــــــه ســــــــەر دۆزەخـێ
دڵی وەرزێڕانی تـۆو چێن دەكـــەوێته ماندوو بـونـەوە
بەڵام كاتی دروێنه لـــــــــه خۆشیان دەحەسێنـــەوە
له كۆڕی ئەویندارانـ ئـــەو كـەسه به ڕازی گەیشتـووە
كه له كۆتادا به جامی هەقیقی گەیشت و خــواردیـەوە
تـازە بوكێكی لاو شكـایـەتـی حـــاڵی خـۆی دەكرد
له پیرێكی ڕەزا گرانی نـــا میهرەبـــان بۆڵەی دەكرد
چاك نیه دەگەڵیدا چەن ساڵان به تاڵی ژین بەرێ كەم
ئەمن دڵ به خەمم، ئەوانەشی لەو ماڵەدا لەگەڵ منن
وەكو من نین، ئەوان زۆر بێ بـــاك و بێ خـــەمـــن
خــۆ ژن و مێرد دەگـەڵ یەكـــدی هێنده خۆشەویستن
هەر دەڵێی دوو مێشك و یەك گیان و لاشه و پێستن
لـــەوەتەی لـەلای ئەو پیاوەم ئەمدی بۆ تاقه جارێكی
بـــه ڕوومدا پێ بكەنێ و بیكات كەیف و خۆشییەكی
پیری مبـــارەك ئەو قسەیەی بیست، پیر كه قسەزانه



**وەلاَمێکی خۆشی خـۆی دایــەوە پیــرانە و ژیــرانە**

**گـوتـــی: بـــــاری جوان و جـوان چاکــان بکێشە**

**حــەیفە ڕوو لـــــــە کەسێك وەرگێڕی و لالـوت بیت**

**کە جارێکی تر نەتوانی یەکێکی وا بە دەست بێنیەوە**

**بــۆچ ناتەبایی و ناڕەحەتی لەگەڵ کەسێك دەنێیەوە**

**خــۆ ئەگەر توڕەبێ، بــــــە جــاریَ لە نێوت دەبا**

**چــەشنی نۆکــەر قایل بـە، بە فەرمـــــانی خـــودا**

**چــون بێ شك چنگ نـاکەوێتەوە خوداوەندگاری وا**

*****************

**یەکێك بە مەجنونی گوت ئەی موبــــــارەك پێ**

**چت لێ قەوماوە بۆچی نـایەوە ناو هۆزی حــەی**

**هەواو عیشقی لــــــەیلێت لـــە دڵدا نەمـــــاوە**

**یـــــا خەیــاڵ و مـەیلی لـەیلێت گـــــۆڕاوە؟**

**مــەجنون کـە گوێی لێ بوو دەستی کرد بە گـریان**

**گوتی بڕۆ کاکە وازم لێ بێنە و برینانم مەکولێنەوە**

**ئەمن بـە دەردی عیشقەوە دڵ بریندارو دەتوێمەوە**

**هــەستــە بــڕۆ، خـوێ بـــە برینــانمدا مەکەوە**

**دووری لــــــە لەیلێ سەبــر و قـــــەراری نییە**

**ئێستــا کــــە لێــرەم و دوورم لــە نــاچــارییە**

دیسـان بـە مەجنونی گـوت ئەی پیاوی چاك

تا بە لەیلیٚ بڵێم ئەگەر بـۆئەوت هەیە پەیامێك

مەجنون وتی دەخیلە ناوی من لای دۆست نەهێنی

چون حەیفە باسی من لە جێیە بکریٚ ئەوی لێیە

وەهـام لـەبیـرە لـە پیرێکی دانـا

کە پەرێشانحالێك بەهۆی عیشقەوە ڕوی کردە سارا

بـاوکی لـە تـاوانی خـەو و خواردنی لێبڕا

لۆمەی کـوڕەیان کرد، بۆچی ملت ناوەتە کێوان

وتی لەو ڕۆژەی یارم بە بەندەی خۆی حساب کردم

ئیتر بێجگە لـەوی هۆگریم بـە کـەسەوە نەما

**بەشی چوارەم: باسی تەوازوع و خاکیەتی**

یەزدانی پـاك ئـەتۆی دروستکردووە لە خاك[15]

کـەوابوو ئەی بەندە هەمیشە خاکی بە وەك خاك

---

[15]. ز خاک آفریدت خداوند پاک
پس ای بنده افتادگی کن چو خاک
حریص و جهان سوز و سرکش مباش
ز خاک آفریدندت آتش مباش
چو گردن کشید آتش هولناک
به بیچارگی تن بینداخت خاک
چو آن سرفرازی نمود، این کمی
ازان دیو کردند، از این آدمی



چـــــاوچنـــۆك و ســــــەرەڕۆ مــــەبە
لـــــە خــــاك دروستكراوی ئــــــاگر مـەبـە
كـــــاتێ ئــــاگری سـامنـاك گەردنی بەرز كرد[16]
گـڵ ســـەری دانـەوانـد و گـــــەردنكەچی كـــــرد
چونــكە ئــــــەویان سەری بڵندو ئەمیان نەوی كرد
لـــــەو شەیتـــــــان و لەمیش ئادەمی دروستكـرد

**********

لـە پەڵـە هەورێك دڵــۆپە بـــــــــارانێك چـۆڕا[17]
خەجـاڵەت بـــوو كە چاوی بە دەریای بێ بن كـەوت
گوتـــی لــــە جێیەك زەریــــــا هـەبێ ئەمـن كێم
مــــــادام ئـەو هەیەو بــــــــەڕاستی ئەمن چیم
چـونكە خــــــــــۆی بـــــــە بچــوك بینی

[16]. مەبەستی ئیبلیس شەیتانە، كە سجدەی ڕێزی نەبرو خۆی بەرزتر بینی، ئەوەی خودا لە قورئاندا گێڕاویەتەوە..

[17]. یكی قطره باران ز ابری چكید
خجل شد چو پهنای دریا بدید
كه جایی كه دریاست من كیستم؟
گر او هست حقا كه من نیستم
چو خود را به چشم حقارت بدید
صدف در كنارش به جان پرورید
سپهرش به جایی رسانید كار
كه شد نامور لؤلؤ شاهوار
بلندی از آن یافت كو پست شد
در نیستی كوفت تا هست شد

له قەراغ سەدەف وەخۆی گرت بە گیان پەروەری کرد

ئاسمـــــــان ئــــــەو دڵۆپەی گەیاندە جێگایەك

مرواریـــەکی بـــــە نــــــــاوبانگی لێ پەیدا بوو

بڵندی دەستـکەوت چـــونکە خـــۆی پـێ کـــەمبوو

**داستانێك لە خاکیەتی بایەزیدی بەستامی**[18]

بیستومە لـــــە بـــــەرە بەیـــانی جێژنێ

بایەزید دەهاتەوە لـــــــــــە حەمـــامێ

بێ ئاگـــــا تەشتێك خـــــۆڵ و خـــشـــت

لە باڵاخــــــانەیەکەوە بـــەسەریاندا ڕشت

کــــــــــــە دیتی سەرو مـــەندیلی لێکهاڵا

دەستی شوکرانـــەی بـــــە سەرو ڕدێنیدا دێنا

گوتی ئەی نەفس! ئـــەمن لایقی ئــــــاگرم

چۆن بە خشتوخۆڵ هەڵچم ورووو تێك نێم

---

[18] ـ شنیدم که وقتی سحرگاه عید
ز گرمابه آمد برون با یزید
یکی طشت خاکسترش بی‌خبر
فرو ریختند از سرایی به سر
همی گفت شولیده دستار و موی
کف دست شکرانه مالان به روی
که ای نفس من در خور آتشم
به خاکستری روی در هم کشم؟



سەعدی لە میانی ئەو داستانەدا چەند بەیتێك لە وەسفی خاکیەتی و سادەیی و تەوازوع و سەرکۆنەی فیز و خود بینی و ڕۆح زلی دێنێتەوە, کە جوانترین وەسفی خەسڵەتی خاکیەتیە لە شێعری فارسیدا.
دەڵێن خەڵکی گەورە خۆ پەسەند و خۆبین نیە, ئەوی کە خۆ بینە, خودا بین نیە. ئەگەر کەسێك دەیەوێت لای ئەوانیدی گەورە و بەڕێز و قەدر بێ, نابێ خۆی بە گەورە بژمێرێ، چون ئیدعای بوزورگی، نەتەنێ هۆی گەورەیی نیە، بەڵکە هۆی کەماسیشە.

خاکیەتی سەری گەورەیی بەرز دەکاو دەتباتە سەرێ

لە خۆبایی بوون بە قوڕێتدا دەباتە خوارێ

لەخۆ بایی تەپڵی سەری وە عەرزێ دەکەوێ

بڵنیت ئەوێ ئەگەر سەر بەرزیت دەوێ

لە پیاوی مەغرورو دنیایی چاوەڕێی دنیات نەبێ

خوداناسی لە خۆپەرست داوا م، ، مکە و مەگەڕێ

بە چاوی کەم مەڕوانە ئەوانیدی, مرۆڤی هۆشمەند هیچ کات دوچاری دەردی خود بینی نابێ, لە ناو خەڵکی خۆی بە گەورە نانوێنێ، هیچ مەقامێك باڵاتر نیە کە لە ناو خەڵکیدا بە خۆشڕوو، ڕەزاسوك نێودێر بێ. ئەگەر یەکێك لە بەرانبەر تۆدا فیز بنوێنێ, لە چاوانتدا گەورە نابینرێ، لە خۆبایی بونی تۆش بە هەمان چەشن لە چاوی ئەوانیدی کەم و بچوکی.



ئەگەر پێگەو مەنزڵێکت هەیە، بە چاوی سوك مەڕوانە زێر دەستەو خواریٚ، زۆرێك لە خاوەن پایە لە کورسی دەسەلآت پێیان خلیسکا و هاتنە جێیان چینی خواریٚ، تەنانەت چاکە کارانیش لە مەترسی دەرچوون لە پاکیدان.

یـــەکێك ئـەڵقەی کـــابەی وا بـــــە دەستـــەوە
یـــــەکیٚ لـــــە شەڕابخـــانە بە سەرخۆشی کەوتووە

گەر خودا بانگی بکاو لێی خۆشبیٚ، کیٚ هەیە ڕێی لیٚ بگریٚ
وەگـــەر لە دەست بە ئەڵقە توڕەبیٚ کیٚ هەیە وەی گەڕێنیٚ

سەعدی لە ئامۆژگاریەکانی خۆیدا وێڕای زانست، تەواوی تاکەکانی کۆمەڵگە لە جیهانبینی خۆی بەهرەمەند دەکات، کەڵك دەبەحشیٚ، ناقڵمەند و ئەهلی کەماڵیش سوودی لیٚ هەڵدەکرێنن، بۆ خوو خدەی چاك بانگ دەکات، بەردەوام وەبیر ئەهلی فەزیلەت و زانا دێنێتەوە کە دەگەڵ خەڵکی نەزان و نەفام تێکنەگرێن.
کاتیٚ نەفامیٚ یەخەی دانایێ دەگریٚ و کێشە و بەردەی پێدەکات، زۆر شتی بەدوادا دیٚ، سەعدی لەو بارەوە وەسیەتی خودا دێنێتەوە کە پێویستە دەگەڵ نەزانان نەرم بن، تێکنەگیرێن " **واذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاما** " هەر لەبەر ئەوە لە چەندین داستاندا یادەوەری لەو باسە دەکات.



ڕەفتاری سەلامەت دەگەڵ نەفامان، جۆرێکە لە خاکیەتی. سەعدی لەو بارەوە چیرۆکێکی لە بابەزیدی بەستامی هێناوەتەوە، مەرجی دانایی خۆ پارێزیە لە دەمەتەقێی نەزانان، چونکە زاڵبوونی دانیشمەند لە دمبەدمەی نەفاماندا جێی شانازی و بردنەوە نیە، چ بگا بەوەی وەبن کەوێ، خۆ ئەو دەمی ئابڕوی دەکەوێتە گۆڕێ.

**١ چیرۆکێکی تر وەربگرین[١٩]**

بیستومە زانایەکی خودا پەرست
بەرۆکی دەرویتێکی گرت
پیاوی دڵ خاوێن لەو گەنجی دڵ ڕەش
زللەیەکی پاشە ملی خوارد و سەبری گرت
یەکێ وتی ئەتۆش پیاوی بۆ دەست ناکەیەوە
حەوسەڵە بێ جێیە دەگەڵ ئەو پیسی ناپیاوە
کابرای خاوێن کە ئەو قسەی گوێ لێ بوو
پێی گوت ئەو چەشنە قسانە دەگەڵ من مەکە

---

[١٩] شنیدم که فرزانه‌ای حق پرست
گریبان گرفتش یکی رند مست
ازان تیره دل مرد صافی درون
قفا خورد و سر بر نکرد از سکون
یکی گفتش آخر نه مردی تو نیز؟
تحمل دریغ است از این بی تمیز
شنید این سخن مرد پاکیزه خوی
بدو گفت از این نوع دیگر مگوی
درد مست نادان گریبان مرد
که با شیر جنگی سگالد نبرد
ز هشیار عاقل نزیبد که دست
زند در گریبان نادان مست

مرۆی سەرخۆشی نەزان بەرۆکی ئینسان دەدڕێ

بەشکم دەگەڵ شێرێکی شەڕانی بجەنگێ

کەس لە پیاوی ئاقڵ و هۆشیار ناترسێ

کە دەست لە بەرۆکی نەزانی سەرخۆش بنێ

لە داستانی دواتردا سەعدی چیرۆکی دەشت نشینێك دێنێ, کە سەگێك پێیەکانی وی دەگەزی, کچە چکۆلانەکەی گوتی: مەگەر ددانی بڕەت نین, ئەتۆش ڕۆی بایە، کابرا گوتی: نابێ ئینسان ببێتە سەگ و ڕەفتار سەگی بکات.

سەگێك بە لاقی سارا نشینێك ڕۆنوسا[20]

بە ڕقێکی وا کە ژاری لە ددانان دەڕژا

بێچارە لە تاوان خەوی لێ نەکەوت شەوێ

کچۆلەیەکی بچوکی هەبوو لە ماڵێ

[20]. سگی پای صحرا نشینی گزید
بە خشمی کە زهرش ز دندان چکید
شب از درد بیچارە خوابش نبرد
بە خیل اندرش دختری بود خرد
پدر را جفا کرد و تندی نمود
کە آخر تو را نیز دندان نبود؟
پس از گریە مرد پراگندە روز
بخندید کای مامک دلفروز
مرا گر چە هم سلطنت بود و بیش
دریغ آمدم کام و دندان خویش
محال است اگر تیغ بر سر خورم
کە دندان بە پای سگ اندر برم
توان کرد با ناکسان بدرگی
ولیکن نیاید ز مردم سگی



بـــــــە تورەییەوە بـــــــە بـــاوکی گـــوت

مـــەگـــەر ئـــــەتۆش ددانت نـــــەبـــــــوون

دوای گـــــریـــــــان، کـــــابـــرا پـێـکـــەنـــی

گـــوتـــی ئـــــەی بـــابـــۆکـــــەی دڵـــــڕوو

ئـــــەمـــــن ئــەگـــــــەرچی هێزو توانام هەبوو

پێم حەیف بــــــوو زارم دەگەڵ سەگ تێکبەستم

مــــــــەحـــــاڵە ئـــــەگەر تیریشم وە سەری بکەون

بـــــــە ددانی خـــــۆم پێی سەگ بـگـــــــــەزم

ئینســـــان دەتوانێ دەگەڵ نـــــاکـەسان بجەنگێ

بـــــــــەڵام ڕەفتــــــار ســـەگی لــە ئینسان نـاشێ

سەعدی کۆمەڵناس و مامۆستای ئەدەب و ئەخلاق، کە ڕەوشت جوانی بە باڵاترین وێنە لە شێعر و فەرهەنگی خۆیدا دێنێتە بەرچاو و دڵ. لە هەمانکاتدا بە چاوی کینە و بەد ناڕوانێتە هەڵەکاران. ئەوەی ئەورۆ دانایان پێشنیاری دەکەن کە پێویستە دەربارەی تاوان لە هەر کۆمەڵگایەکدا ڕیشەکەی بدۆزرێتەوە و دەربێنرێ، سەعدی حەوت سەد ساڵ پێش بۆ ئەوە چووە، تاوان بەشێك نیە لە گیان و سروشتی کەسەکە، وێڕای ڕەتکردنەوە و قەدەغەی لە ناشرین و بەدەکان هەوڵ بۆ چاکە و جوانیەکان دەدا و ڕێ چارە دەدۆزێتەوە و ڕێنمایی کۆمەڵگا دەکات کە دەربارەی گوناه، تەنێ بیر لە تۆڵە نەکەنەوە، بەڵکە بۆ بنبڕکردنی هۆی هەڵەکە بگەڕێین و ڕێگای لە نێو بردنی بدۆزینەوە.



**هەر لەهەمان بەشی تەوازوعدا، سەعدی داستانێکی تر دێنێ، ئەنجامەکەی ڕەشایی گوناح و سپیەتی ئیحسانە.**

**دزی کردن، یەکێك لەو تاوانانەی هەر لە کۆنەوە دەنێو هەموو کۆمەڵگاکاندا بە زۆری ڕوویداوە و لە بەدترین گوناه دەبینرێ، چونکە هەمیشە بیری ئینسان بەلایماڵدا زیاتر بووە و هەیە، بە چەشنێ هێندێ جار لە پێناو کاسبیدا، یانیش لە پارێزگاری ماڵدا گیانی خۆی لەدەست داوە. کۆمەڵگە ڕقێکی زۆری لە دزییە، کە ئەگەر لە کوچەیەکدا دزی بکرێ، تەواوی ئەو کۆڵانە دەرژێنە سەری و برێ جاریش تا کوشتنیش دەیکوتن. لە حاڵێکدا بۆ تاوانکارانی تر کاردانەوە و سزای ناوا توند، کەمتر ڕێ و شوێنی بۆ هەڵدەگرێ.**

**لەو بارەیەوە سەعدی چیرۆکێك دەگێڕێتەوە. کەسێك چاوی بە دزێك کەوت بەسەر دیواری ماڵە جیراندا هەڵدەگەڕا، لێی کردە حەیتەو لە هەر لایەکەوە خەڵکی بە دار و گۆچانەوە خڕبوونەوە تا دزی بگرن و بیکوتن. دزەکە هەلاتنی هەڵبژارد. کابرا دڵی بە دزی بێچارە سوتا، کە بە هۆی تەنگدەستی و ناچارییەوە دوچاری ئەو گوناح و هەڵەیە بووە. بە دوای دزدا ڕۆیشت و گوتی وەرە با کۆمەکت بکەم، دەچینە ماڵێ، بێ ئەوەی کەس بمان بینێ، هێندێ ماڵ و کەلوپەلت دەدەمێ.**

**کابرای برد، لە سیلەی ماڵێ ڕایگرت، لەسەر حەسارێرا خۆی فڕێدا ماڵێ و هێندێ کەلوپەل و بەرگ و باڵی بۆ هێنا، هەڵیگرتن و چاوەڕێی خاوەن ماڵی نەکرد و ڕۆیشت، بانگی لێکرد ئەهای کابرای دز، بەرگ و باڵەکەی فڕێدا و بەدەست بە تاڵی ڕایکرد.**



مەبەستی سەعدی لەو داستانەدا پارێزگاریکردن لە دزان نیە، بەڵکە چاکەی ئینسان گەلێکی دڵسۆز نیشاندەدا, کە هەتا بەرانبەر هەڵەکارانیش بەزەیی دەنوێنن و هەم دەرسێکیشە کە پێویستە ڕیشەی هەڵە و خراپەکاری دەربێنرێ.

دزێکی پیس بەزەیی بە کەسدا نەدەهات[٢١]

کابرای دڵپاك چاکەی دەگەڵ دزدا کرد

جێی سەر سوڕمان نیە لە خوی ژیران

کە چاکەی بکەن دەگەڵ پیاو خراپان

لە پەنای چاکان دەژین خەراپان

ئەگەریش خراپان شیاوی چاکە پێ کردن نین

سەعدی لە نێو بابەت گەلێك ئەو باوەڕەی خۆی دوپاتە کردۆتەوە کە خراپە بە خراپە لە ناو نابرێ. چاکە و چاکەکاریش دەتوانێ بەدکاری لە کۆمەڵگە ڕیشەکێش و لەبن دەربێنێ.

---

[٢١]. خبثی که بر کس ترحم نکرد

به بخشود بروی دل نیک مرد

عجب نیست در سرت بخردان

که نیکی کنند از کرم با بدان

در اقبال نیکان بدان می زیند

و گر چه بدان اهل نیک نیند

**هەروەتر لە بەشی دووەمی ئیحساندا فەرموویەتی:**

**بدی را بـــــــــــــدی سهل باشد جزا**
**اگـــر مـــــردی احســــــن الی مـــن اسا**

**لـــــه پاداشتی خراپەدا ئاسانە کردنی بەدی**
**چـاکە دەگەڵ بەدکارێکدا بکە ئەگەر مەردی**

**هـەر لـەو بەشـەدا داسـتانێکی تـر دێنـێ کـە خاکیـەتی و چـاکەی لـە خۆهـەلگرتووەو دەڵێ: شـەوێك لـە شـەوان پیـاو چـاکێك لـە گۆڕسـتان دەگەڕایەوە، سەرخۆشـێکی بینـی سازێکی لـە مێـزێ بـوو, کەوتـە سـەرو گوێلاکی پیاو چاك، سەری کابرای شکاندو سازەکەی خۆیشی وردو هاڕ کـرد. کـاتێ تـاو هـەڵات، کـابرای خـوا پەرسـت مسـتێك پـارەو زیـوی بـۆ سەرخۆشـی بـرد, ئـەتۆ دوێ شـەوێ مەسـت بـووی، بـە سـازەکەی خـۆت سـەری مـن و سـازەکەی خۆشـت شـکاند. برینـی سـەری مـن چـاك بـوو، بـەڵام سازەکەی تـۆ پێویسـتی بـە چـاککردنەوەیە، هـا ئـەو پـارەو پوڵـە بگرەو چاکی بکەوە.**

**لـە کۆتـایی بەشـی چـوارەمدا چـەن بـەیتێکی تـر دێـنێ لـە باسـی خـاکی بوون و کەم نەفسی:**



الا ای کـه بـــــــر خـــــاك مـــــا بگذری

به خــــاك عـــــزیـــــــزان کـــه یـاد آوری

که گر خــــــاك شد سعــــــدی او را چـــــه غم

کـــــه در زنـــــــدگی خــــــاك بودەست هم

ئەهـــــای ئەو کەسەی بەسەر گۆڕەکەمدا تێـدەپـەڕی

بە خاکی ئازیزانت سوێند دەدەم لێم بکەی یـادەوەری

خـــــۆ ئـــــەگەر سەعدی بوو بە گڵ هیچ باکی نیە

چـــون لـــــــە ژیانیشدا هەر خـــاکی و گـــڵ بووە





**بەشی پێنجەم: باسی ڕازی بوون**

**یەکێ لە کەمالاتی ئینسان خەسڵەتی ڕازیبوونە بە ئەو شتەی کە خودا پێی دەدا. ڕەزا لە نێوان خالیق و خەلقە، دوو لایەنەیە, هەم بەندە لە خودا ڕازی بێ و هەمیش خودا لە بەندە.**

**سەعدی بڕوای وایە کە ڕەزابوونی خوداوەند پەیوەستە بە ڕەزامەندی و ڕەزای بەندەکان.**

**خـــــدارا آن بنده بخشـــــایش است**

**که خلق از وجودش در آسایش است**

**لە چیرۆکێکدا: هەم ڕازی بوون لە بەرانبەر هەق تەعالادا وەسیەت دەکات هەمیش ڕوانین لەوەی کە خودا لە خۆمان زیاتر چاکەی بۆ ئێمە دەوێ. بڕوای وایە حەواڵەکردنی خۆت و کاروبار، یەك لە خەسڵەتە نایابەکانی ڕازی بوونە و نمونەش لەو بارەیەوە دێنێتەوە[٢٢].**

---

[٢٢]. شتر بچه با مادر خویش گفت:
بس از رفتن، آخر زمانی بخفت
بگفت ار به دست منستی مهار
ندیدی کسم بارکش در قطار
قضا کشتی آن جا که خواهد برد
وگر ناخدا جامه بر تن درد
مکن سعدیا دیده بر دست کس
که بخشنده پروردگارست و بس
اگر حق پرستی ز درها بست
که گر وی براند نخواند کست
گر او تاجدارت کند سر برآر
وگرنه سر ناامیدی بخار



**" بەچکە حوشترێك دوای ڕێڕەوێك بە دایکی خۆی گوت، ئەرێ ناکرێ وچانێك بدەین و بخەوین؟ حوشتر گوتی: ئەگەر ئاوسار بەدەست خۆم بایە، کەس دەنێو قافڵەی کاروانەدا ئەمنی نە دەبینی، دەستی چارەنووس بۆ هەر جێیەك بیەوێ کەشتی بۆ وێ دەبات، با کەشتیەوانیش حەز نەکا و لە داخان یەخەی خۆی بدڕێ، ئەی سەعدی بە هیوا بەو چاو لە دەستی کەس مەبە، خاوەن بەخشندە و دەهەندە هەر پەروەردگارە و بەس، ئەگەر هەق پەرستی ڕاستی چاو لە دەست مەبە، ئەگەر وا نەبی کەس ئەتۆی ناوێ ".**

**سەعدی، دڵسۆزی و پاکی لە کردەوەدا بە هۆی ڕازیبوونی خودا دەبینێ و لە چەند بەیتێك یادێکی لێدەکات[٢٢]**

**" خوداپەرستی بە پاکی و نیەت چاکی جوان و بە کەڵکە، بە کاری چی دێ پێستی بێ دەنگ و پوچەڵ، بە ئەندازەی بونیەی خۆت، خۆت نیشان بدە، خەجاڵەت نەبوو ئەوەی هەیبوو باسی کرد.**

---

[٢٢] عبادت به اخلاص نیت نکوست
وگرنه چه آید ز بی مغز پوست؟
به اندازه بود باید نمود
خجالت نبرد آن که ننمود و بود
اگر کوتهی پای چوبین مبند
که در چشم طفلان نمایی بلند
منه جان من آب زر بر پشیز
که صراف دانا نگیرد به چیز
زر اندودگان را به آتش برند
پدید آید آنگه که مس یا زرند



ئەگـەر قوڵـە پیـاوی لاقـی دار بـە خۆتـەوە مەبەسـتەوە، بـۆ ئـەوەی لەبەرچاوی منداڵان کەڵەگەت دیار بی. گیانەکەم ئەکەی بە ئـاوی زێـڕ فلس ئاوەزێڕ بکەی، کابرای زێڕ ناس بە خۆڕایشی ناوێ. ئـەو کەسـانەی کە ئاوەزێڕ کراون دەیانخەنە ئاگردانەوە، ئەو وەختی دەردەکەوێ ئـاخۆ مسن یانە زێڕ و زێڕاوە.

******************

**بەشی شەشەم: باسی قەناعەت**

خدارا ندانـــست و طـــــــاعت نکرد

که بر بخـــت و روزی قنـــــاعت نکرد

خودای نـــەناسی و تــــاعەتی نەکرد

بە بەخت و بەشی خۆی قنیاتی نەکرد

سەعدی مەزن، بەشی قەناعەت بەو بەیتە دەکاتەوە, هەر لـەو بەیتـەدا چەندین ئامـاژەی تێدایـە کـە پێوەنـدە بـە قەناعـەت. کـە بـە کـورتی و پوختی و بێ وێنەیی دایڕشتووە. هەوەڵێن، ئەو کەسەی قەناعـەتی نیـە خوداش ناناسێ. دووەم، بابای بێ قەناعـەت و چاو بڕسی هەمیشە لـە ڕزق و ڕۆزی خـــۆی ناڕازییـــەو تاعـــەت و بەنــــدەگی حـــەقیقی لێ دەرناکـەوێت. لـە پارچـەی دووەم بابـەتی (بخـت – بـەخت)ئێـو دەبـا, چونکە بە گشتی ئەوانـەی کـە قـانیع نـین، بەخت و هاتنـە پێشیان بـە ناهاوکـار دەزانـن, ئـەوەش هۆی پرتـەو بۆڵـەو شکایەتە لـە بـەخت. کـە



**هێنـدێ جـار هـۆی نـەمانی هیـواو هومێـدەو هـاتنی نـا هومێـدی و دەستەوستانیە.**

**سـەعدی لـە بەشـی قەناعەتـدا وەك تـەواوی بەشـەکانی گوڵسـتانێ، داسـتانێك دێنـێ کـە هەریەکـەیان یـا بـاس لـە جـوانی و چـاکی و قەناعەتە، یانیش عەیب و کەمایەسی و نەبونیەتی.**

**لـە چیرۆکێکدا لـە بارەی تـەماع و دونیـا ویستی زۆر قسێ دەکات. لـە چیرۆکێکی تر چاو لەدەستی خەڵك سەرکۆنە دەکات. ئینسـان جگـە لـە خودا چاوی لە هیچ کەس نـەبێت. ستایشی بـێ جێـی ئەوانیـدی پەیـدا بوونی حیرس و تەماحە, تەماحیش پێچەوانەی قەناعەتە.**

**قەناعەت بەمانای ژینی بێ جوڵەو کۆشش نیـە، نـابێ لـە تێکەڵکردنی قەناعـەت و بـێ خـەمی بکەوینـە هەڵـە. قەناعـەت تایبـەت نیـە بـە تەنگدەسـتان، بەڵکـە پێویسـتە سـەروەتدارو هـەبوو پـتر بـە خەسـڵەتی قەناعەت, کە بێ نیازی دەرونیە نەك هەژاری، وەسفدار بن.**

**لە هەوەڵین چیرۆکی فەسڵی قەناعەتـدا ئـەو خاڵـە دەوروژێـنێ کـە بـێ نیازی و چاو لـە دەسـت نـەبوون کـە تایبەتمەنـدی قەناعەتـە، جیـاوازی ئینسانی هەژارو دەوڵەمەندە.**

**قنـــــاعت کن ای نفـس بــــــر اندکی**
**کە سلطان و درویـــــــــــش رجحان ننهد**

**ئەی نەوس بـــــە هێندێ قەنـــــاعەتت بێ**
**سوڵتان و هەژارت لە بەرچاوا وەکو یەك دەبێ**



له چیرۆکێکی تردا له سەرکۆنەی تەماحـدا داسـتانی کەسێك دێنـێ، کـه بـه دەوری خـوارزم شـادا تـەوافی دەکـرد و سـەر دەخاتـە سـەر خـاك. کوڕەکەی لێی پرسی، مەگەر نەتدەگوت تـەنیا دەبێ بـۆ نوێـژێ ڕوو لـە کابـە بکـرێ؟ ئـەوڕۆ بۆچـی ملـت سوڕاندووەو ڕووەو لایێکـی تـر نوێـژێ دەخوێنی؟

نگفتی کـه قبله اســـت ســـوی حجـــاز؟
چرا کـردی امـــــروز از ایـــن سو نماز؟
مبر طاعــــت نفـــس شهـــوت پرسـت
که هر ســـاعتـــش قبله دیگـــر اســـت

گوێ له مستی نەوسی ئارزوو پەرست مەبە
چون هەر سەعاتەو ڕووگـــــەی جێیەکە

ئنجا سـەعدی چـیرۆکێکی تـر لـە سـەرکۆنەی تـەماح و چـاو لـە مـاڵی خەڵکی دێنێ، ئەو کردەوانەی لـە پێنـاو هەوەسـی تـەماحکاردا دەکـرێن، کە له هەریەك له چیرۆکەکان پەنـدو ئامـاژەی پـڕ مانـا هەیـە، سـەعدی چەندین جار ئاماژە بەو خاڵە دەکات کە نـابێ لەبـەر خـاتری جەسـتە، گیان بخرێتە مەترسی، تەماح و چاو پـڕ نـەبوون ئینسانان لەبـەین دەبـا، قەدری گیان دەباو دەیکاتە قوربانی جەستە[٢٤]

[٢٤]. یکی را تب آمد ز صاحبدلان
کسی گفت شکر بخواه از فلان
بگفت ای پسر تلخی مردنم
به از جور روی ترش بردنم
کند مرد را نفس اماره خوار



" یەکێ لە پیاو چاکان نۆبەتێی هاتێ، کەسێك گوتی شەکری لە فلانـە کەس داوا بکە، دەڵێن بۆ تاو لەرزە باشە. گوتی هەی کوڕی چاك تـاڵی گیان کێشانم باشترە لە منەتی پیاوی نێوچەوان تـاڵ. نەوسی سەرکێش ئینسان ڕیسوا دەکا، ئەگەر خاوەن زیبك و هۆشی ڕێزی لێ مەگرە. هەرچی نەوست داوی کردو بە قسەی بکەی، لە دەورانی ژینت سوێری و نـامرادی دەچێژی. دەمبەدەم تەنـدوری زگـت داگیرسێنی، دەبێتـە موسیبەت ڕۆژی هەژاری. پیاوی زۆر خۆر حەمباڵی باری ورگـە، کـە خواردنیشی دەستنەکەوت حەمبالی باری خەمە. نۆکەری زگ بـە شەرمەزاری دەبینی، پیاو زگی لە برسان قۆڕەی بکات باشترە لەوەی دڵی لە هەژاریان هەڵێت.

**ئەوەی ددانان دەدا، نانیش دەدات**

نە تەنێ بەیتە شێعری و ڕستەکانی سەعدی بوونەتە پەند و بەڵگە و نمونەی سەر زاران، بەڵکە گاهێ حیکایەتەکانی کە لە ڕستە و شێعر پێکهاتوون لە بیر و زەینی فارسی زمانانـدا ماوەتەوە، کە بە گشتی

---

اگر هوشمندی عزیزش مدار
اگر هرچه باشد مرادت خوری
ز دوران بسی نامرادی بری
تنور شکم دم بدم تافتن
مصیبت بود روز نایافتن
کشد مرد پرخواره بار شکم
وگر در نیابد کشد بار غم
شکم بنده بسیار بینی خجل
شکم پیش من تنگ بهتر که دل



نەزبەر کردنی حیکایەتی پەخشانی یا شێوەی شێعر و بەستە لە نمونەو پەند بۆ یادەوەری مانەوەی لە بیر و زەین دژوار ترە.

هیچ داستانێك لە شێعر و پەخشانی فارسی وەك ئەو حیکایەتەی خواریّ کە تەنیّ خودایە ڕازقی هەمووان ئەوەندەی ناو و ناوبانگی دەر نەکردووە و بە وێنەی نمونە و پەند نەهاتۆتەوە.

" منداڵێك ددانی ڕوان، باوکی دیتی و خەیاڵات بردیەوە، گوتی ئەمن نان و بەرگی بۆ لە کویّ بێنم، خۆ پیاوەتیش نیە وێڵی بکەم و بەخێوی نەکەم، کاتیّ ئەو بەدبەختە قسەی بۆ خێزانەکەی گێڕایەوە، بڕوانە ژنیّ چۆن جوامێرانە وەڵامی دایەوە، گوتی پیاوە: ترسی شەیتانت لە دڵدا نەبیّ تا شەیتان لە خەفەتان بدڕیّ، هەتا ئەو منداڵە گیانی دەبەر بیّ، ئەو کەسەی ددانان دەدا نانیش دەدات، خودا گەورە و توانادارە، هەر ئەوە ڕۆزی دەری هەموو گیان دەبەرێك، ئەو خودایەی نەخشەکێشی منداڵە دەنێو ورگدا، هەر ئەو خودایە نووسەری تەمەن و ڕزقیشە، کەسیّ کە بەندەیەك دەکڕیّ ژیان و بژێویشی بۆ دابین دەکات، جا چۆن ئەو کەسەی کە خالیقی بەندەی خۆیەتی ژیانی بۆ دابین ناکات، ئەتۆ هیواو ئومێدت بە پەروەردگار نیە، هێندەی غولام بە خاوەنەکەی خۆی هەیەتی.

لە چیرۆکێکی تردا هەر لەبەشی قەناعەتدا، سەعدی زێدە خواستن لە ماڵ و خانوبەرەدا ناپەسند دەژمێریّ، پشك و بەشی ئینسان لەو دنیایەدا کە تێیدا دەژین سنور دارە، ئینسان لێرە وەك موسافیرێك وایە، کەسێکیش لە سەفەردا بیّ، بە موسافیرخانە دڵ نابەستێتەوە.

لە یەکیّ لە قەسیدەکانیدا فەرموویەتی:



**دل ای رفیق بدین کـــــاروان ســـرای مبند**
**که خانه ســــــــاختن آیین کــــاروانی نیست**

**ئەی هاوڕێ دڵ بەو کـــاروان سەرایە مەبەستە**
**ماڵ سازو پێکەوەنان ڕێ و شوێنی کاروان نیە**

**سەعدی سەرەتاو قۆناغی هەوەڵی ژین بە خۆش دەبینێ، بەڵام بەو مەرجەی کە جاویدانی و نەمر بێ.**

**خوش است عمر دریغا که جــــــاودانی نیست**
**پس اعتماد بر ایــــــن پنج روز فـــــانی نیست**

**ژیـــــان خــــــۆشە، حەیفێ جــــاویـــــدانی نیە**
**کەوایە دڵنیایی بەو پێنج ڕۆژی فانیە کەڵکی چیە**

**لە حیکایەتێکی تری بۆستانێدا هەمان مانای بەیان کردووە، کە خاوەن دڵێ، خانوچکەیەکی ساز کرد بوو، یەکێك پێی گوت: ئەتۆ دەستت دەڕوا بۆچی ماڵ و حاڵێکی چاکتر پێکەوە نانێی، جوابی دایەوەو گوتی: بەڕێکردن و بەجێهێشتنی ئەو خانوچکەیە بەسە.**

***************************



**بەشی حەوتەم: باسی پەروەردە**

سەعدی لەو بەشەدا لە بابەتی جوێ جوێ، لەمەڕ پەروەردەی ئینسان دەدوێ، هەم لە ڕفتارو خەسڵەتی چاك، كە مرۆڤایەتی دەستی پێوە بگرێ، هەمیش لە خەسڵەتی ناپەسند تاوەكو خەڵكی خۆیانی لێ دوور بگرن. لەسەرەتای بەشی پەروەردە دەستپێكی ڕێنمایی و تەوسیەی سەعدی، كەمدوێیە، كورت و پوخت گۆیی، تەنیا یەك هونەری ئەدەبی لە شێعرو پەخشاندا نیە، بەڵكە پێویستە ئینسان لە جۆرو بەشەكانی قسەو گوفتاریشدا ئاگاداری زارو زمان بێ.

خودی سەعدی كە پێی گوتراوە مامۆستای گوتارو وتەو وشە، بەلاّم لە دانیشتنەكانیدا هەمیشە كەم دوێ بووە، لە حاڵێكدا میراتی سەعدی لە شێعرو ئەدەبی فارسیدا كاملترین گەنجینەی ئەدەبە، تەواوی وردو درشتی ژیانی مرۆڤی لە خۆ گرتووە.

هەر بەو چەشنە سەعدی كورت و پوخت تەواوی بابەتەكتنی ژیان، هەر لە منداڵی تا ساڵداری شەن و كەو دەكا، مامۆستایە بۆ تەواوی كایەكانی ژیانی ئەخلاقی، پەروەردەیی، كۆمەلاّیەتی..

لە سەرەتای بەشی پەروەردەدا بە باسی فەزڵ و گەورەیی كەم دوێیی دەست پێدەكات.



ئەگەر پێی خۆت لە داوێن باوێی بە چەشنی كێو
لە گەورەیی و شكۆدا سەرت لە تاقی ئـــــاسمانە



لەو بەیتەدا ئەو خاڵە دەبینرێ کە هۆی زۆرینەی هەڵەو گوناحەکان لە زمانەوە سەرچاوە دەگرێت؟ هەڵەکانی زمان دەبێتە هۆی زیان مەندی لەو دنیایەو ڕەنج بەخەساری قیامەتێ. ئینسانی دم پڕ لە قسە ئەرزشی قسەکانی لە نێو دەبات, خەڵکی کەمتر گرنگی بە قسەکانی دەدەن، چونکە قسەی چاك و شیرین وەك مرواریی نایاب و گرنگ بەهایە, قسەی زۆرو بۆر وەك خیزو خۆڵ و تۆزی بەربایە، ئەو کەسەی پڕگۆو درێژ داردڕە گوێچکەکانی خۆی لە قسەی بێکەڵك پڕە، لە نیعمەتی قسەی ئەوانی دیش کە ڕەنگە سودی بۆی هەبێ بێبەش و بەدەرە.

" ئەوانەی گەوهەری ڕاز دەناسن، دەمی خۆیان هەڵنەبڕی مەگین بۆ قسەی گەوهەرین نەبێ. زۆر بڵێ گوێی ناخێنراون، ئامۆژگاری وەرناگرێ، مەگەر لە زمان گرێدان و بێدەنگیدا. ئەگەر بتەوێ قسە بەدوای قسێدا بکەی بە بێ پشوودان، شیرینی گوێ ڕاگرتنت لە کەس دەستناکەوێ. نابێ بەبێ فکر کردنەوە قسان بکەی، باشیش نیە قسەی کەس ببڕی. ئینسان کە لە قسەی هەڵەو ڕاست فکر بکاتەوە، باشترە لە ژاژێ جووی حازر جەواب. قسە کردن خۆی نیشانەی ئەقڵ و کەماڵە، کەوابێ خۆت کەم مەکە بە قسەی هەڵەو پەڵە. قەت پیاوی کەم دوێ شەرمەزار نابینی، دنکە جۆ میسکێك باشترە لە کۆ گڵێك. خۆ بپارێزە لە نەزانێك کە بە قەت دە پیاوان قسان دەکا، قسەی پیاوی نەزان و تەنەکە کوتان وەك یەکە. سەد تیرت هاویشت هەر سەدیان هەڵەن، ئەگەر ژیرو زرنگی یەك تیری باوێ و بیهەنگێوە. بۆچی ئینسان لە پەنامەکیدا قسەیەك بکاو لە بڵاو بوونەوەیدا خەجاڵەت بکا. زووری دڵت بەندیخانەی ڕازە، وریابە شاری ڕاز بە ئاوەڵایی نەبینن. لەبەر



ئەوە پیاوی زانا زاری خۆی درووە، گرێداوە، وەك ئەوە مۆمی دە زاریدا سوتاوە.

یەکێك لە عەیبەکانی تری قسە کە لەزاروزمان هەڵدەوری، ئاشکراکردنی ڕازو نهێنیەکانی خۆتە. سەعدی لە بارەوە بەردەوام ئامۆژگاری خۆپارێزی دوپات دەکاتەوە.

زێــــرو زەمبەر بـــــە خــەزنـەداری بــــسپێرە
وەلێ ڕازەکان، خۆت ئاگاداریان بەو بە کەسیان مەسپێرە
قســـــە هەتـــــا نـەیکەی دەسەلاتت بە سەردا هەیە
کــــــە کـردت نــــەو بە سەر تۆدا دەسەلاتی هەیە

سەعدی لەو بەشە داستانێك دێنێ، کە زۆرێك لە گرفتاری و تەنگ و چەڵەمەی ژیانی ئینسان دەرئەنجامی زمانی مرۆڤ خۆیەتی، نە تەنێ بەدگۆیی و زمانگێڕی خراپ هۆی پێشهاتی خراپ و دژواریە، بەڵکە گاهێ خۆش زوبانی و دەنگ خۆشیش دیسان هۆی زیانە. لە داستانەکەدا باسی کەسێك دەکات کە لە جەنگ و هەرادا جنێوی دەدا، کەوتنە سەروگوێلاکی کابرا، بەرگ و پۆشاکیان دەبەردا دڕاند، زۆریان تێهەڵدا، دنیا دیدەیەك بەلایدا تێپەڕی و پێی گوت:

چو غنچە گــرت بستـــــە بـــودی دهـــن
دریــدە نـــــدیــــــی چـــو گـــل پیرهن
نبینی کە آتش زبـــان اســــت و بــــس؟
بـــە آبی تــــوان کشتنـــش در نفــــس



ئـــــەگــــەر خــونچـــەی ڕازی خـۆت بـەستبا
کــراسەکەی خۆت بـــە دڕاوی نە دەدیی ئـــاوا
ئـــــاگر هـــــەر زمـــانـــە، ئـــــــــابینی
کە ناتوانی یەکساتە بە ئاوێکی کەم وەیکوژێنی

ئاور، سەرتاپای زمانـە, بـەو زمانـە دەڵێن ئـاور, ئـەو ئـاگرەش بـە ئـاوێ خـامۆش دەبـێ و دەکوژێتـەوە. مـرۆڤ ئەگـەر هونەرمەنـدە هونەرەکـەی دەیناسێنێ و پێناسەی دەکات, پێویست ناکات بـە زمـان لـە هونەرەکـەی خۆی بدوێت.

اگـــــــر مشك خـــــــالــــص نداری، مگوی
ورت هست، خود فـــاش گردد به بــــوی
ئــــــەگەر میسکی ڕووتت نیە فسان مەکە
ئەگەریش هەتە بە بۆنی خۆی بلاوەی دەکا

لە چیرۆکی دواتردا لە زیانی خۆش زوبانی داستان دێنێتەوە, کە عضـد الدولەی دەیلەمی، کوڕەکەی نەخۆشیەکی سەختی توش دەبـێ, باڵنـدەو پەلـەوەرەکانی لـە قەفەسـدا بـوون, یـەکێ پێـی گـوت: بـۆ سـەلامەتی کوڕەکەت ئەو باڵندانە لە زیندان ڕزگار بکە، بـە قسێی کـرد, هـەمووی ئـازاد کـردن, بولبولـە خـۆش ئاوەزەکـەی نـەبێ. بەیانیـەك کوڕەکـەی بەرەو باخەکەی دەچێ, دەبینێ تەواوی باڵندەکان ئازاد کراون, بولبولـە



خۆش نەواكەی نـەبێ، پێكـەنی و گـووتی: باڵنـدەی خـۆش خـوێن نـەتۆ بەهۆی دەنگە خۆشەكەت گرفتار ماوی.

سەعدی دەڵێ ئەو كاتەی قسەم نـەدەكردن، لـە تانـەی زمـان درێـژان لـە ئەماندا بووم.

چو سعدی كە چندی زبان بستە بود
ز طعن زبـــــــــان آوران رستە بود

لـەو بەشـەدا لـە چـەند حیكایـەتێكی یـەك لـەدوا یـەك، سـەعدی باسـی بـەدی و زشـتی غەیبـەت دەكـات، بـەدترین جـۆری غەیبـەتیش دوو زمانیـە، غەیبـەتكار مەبەستی باسكردنی ناشرینیەكانی كەسێكی تـرە بۆ خەڵكی تر. بەڵام شۆڤارو قسە هێنـەرو بێنـەر دەگەڵ غەیبـەتكراوو بیسەری غەیبەتیش دوشمنی دەكات.
قسەكانی دەبێتە هۆی جودایی نێوان دوو دۆسـت و ناشـنا، حـەبیبان لـە خۆشەویستییەوە وەردەگێـرێ بـۆ دوشمنایـەتی و ڕق و كینـە. سـەعدی لە زۆرجێدا باسی لەو جـۆرە كەسـە كـردووە و شـۆڤاری بـە ناشـرینترین خەسـڵەت وەسـف كـردووە. خـراپتر لـە دووزمـانی كـردن لـە نێـوان دوو دوشمن، دووزمانیە لە نێوان دوو دۆست، كە ڕەنگە ببێتە هـۆی جـودایی و هەڵبڕان و دوشمنی.
سەعدی دەڵێ هەر كاتێ ناوی كەسێك لە دانیشتنێك هـات بـە جـوانترین ناو وەسفی بكە.

كسی را كە نـــــام آمد اندر میان
بە نیكوترین نام و نعتش بخوان



هەروەتر کەسانێکیش کە باسی دوشمنت بۆ دەکەن, لە دوشمن دوشمنترن.

کسانی که پیغام دشمن برند
ز دشمن همانا که دشمن ترند

سەعدی وێڕای ئەوەی هەموان لە بەدگۆیی و غەیبەتکردنی ئەوانیدی هۆشداری دەدا, بەلاّم بێگومان خەڵکانێك هەیە گوێ بە قسەکانی سەعدی نادەن, پەند و ئامۆژگارییەکانی نابیستن و گوێی دڵ بۆ وتە و وتارەکانی ناکەنەوە. هاواردەکا خەڵکینە ئەرزش و سەنگ مەدەنە قسەی بەد ویستان, قسە و قسەڵۆك و گوتە گوتی نابەجێ.
سەعدی دەڵێ چونکە ئینسانی وێڵ بەدوای عەیب و عاری خەڵکی، هیچ کەس لە ئەماندا نیە لە دەست و زمانی، بابای تانەدەر و تانەگەڕ, ڕەفتاری مرۆڤ هەر چەشنێ بێ, چاك یان بەد, دروست یان نادروست، ئەو هەر بە کەمی دەبینێ و تانەی لێدەدا، لەبەر ئەوە نابێ ڕەوشتی ژیان ئەگەر دروستە بە قسەی ئەو کەسانە بگۆڕدرێ و کاریگەری بکاتە سەر ژیان و کاروبار عەیبدار بکەن.
لە پایانی بەشی حەوتەمدا, ئامۆژگاریمان دەکات کە پێویستە چاوی چاوگێڕی عەیب و عار ببەسترێ، مرۆڤەکان بە چاك و خراپەوە پێکەوەن, هەروەك کە گوڵ و دڕك و داڵ پێکەوە و دەستە ملانن.
گوڵ بگرە و چقڵیش فڕێدە.

بود خار و گل با هم ای هوشمند
چلە دربند خاری تو گلدستە بند

**گوڵ و دڕك بە سەرێكەوەن، هۆی خاوەن ژیر**
**كـــــــارت بە چقڵ چییە، لە گوڵان بكە بیر**

**تـاوس بـەو جوانیـەی خـۆی، وەلـێ پێیـەكانی ناشـیرنن، ئـەوەی ناشـیرن خووە لە جوانی تاوسێ تەنیا پێ ناجوانەكانی نەبێ نابینێ.**

**كرا زشت خـــــــوئی بـــــود در سرشــــــــت**
**نـــــه بیند ز طــــــــــاوس جـــز پـــــــای زشت**

**ئــــەو كــــەسەی خوو خدەی بەدی لــەگەڵ تێكەڵ بێ**
**جگە لە پێ ناشیرنیەكانی هیچ لە جوانی تاوسێ نابینێ**

**مرۆڤێـك كـە خـۆی عـەیبێكی هەیـە بۆچـی قسـە لـە عـەیبی ئەوانیـدی دەكات؟ ئەگەر كاری بەد ناپەسندە, بۆچی بۆخۆمان كـاری بـەد دەكـەین و بە جیرانانیش دەڵێین خراپـەی مەكـەن. خوداوەنـدی گـەورە بـەڵێنی داوە. لــە بەرانبــەر هەرچــاكەیەكدا دە بەرانبــەر پاداشــت دەدا. تــۆش ئەگەر هونەرت لە كەسێك دیت, لە دە عەیبی بگوزەرەو مەڕوانە.**

*******************

**بەشی هەشتەم: سوپاسگوزاری نیعمەتی تەندروستی**

**لـەو بەشـەدا هـەروەك لـە ناونیشـانەكەدا دیـارە, سـەعدی لـە بـارەی سوپاسگوزاری بەنـدەكان بۆ خـوداو نیعمەتـەكانی دەدوێ, داسـتان دێنـێ، هـەروەتر نـا سوپاسـی بەرانبـەر خـودا یـا خـەڵك سـەركۆنە دەكـات.**



هەوەڵین حیکایەتی بۆ ڕێزو سپاسی دایک داناوە. دایک مافێکی زۆری هەیە و حورمەت و شوکرانەی لە سەروی هەموو شتێکە, هەروەك سەرکۆنەی ئەوانەشەدەکات کە بێ فەرمانی دایک دەکەن و ئەزیەتیاندەدەن.

گەنجێك ڕووی لە قسەی دایکی وەرگێڕا

دڵی پڕ لە کوڵی وەجۆش هێنا

کە دڵی شکا، لانکەی بۆ هێنا

ڕۆڵەی بێ بەزە منداڵیت فەرامۆش کردووە!

دەگریایی و بێدەسەلات و بچوك بووی

شەوانێك لە دەستی تۆ خەوم نەبوو

لە بێشکەدا لاواز و بێ حاڵ بووی

نەتدەتوانی مێش و مەگەزیش لە خۆ دەرکەی

تۆ ئەو کەسە بە دەستی ئەو مێشە لە ئێشدا بووی

ئەورۆ کە خاوەن هێز و پەنجە و دەسەلاتی

ئەوێستاش دەکەویەوە ئەو حاڵەو لە قولایی گۆڕدا

ناتوانی مێرولەیەك لە خۆت وەدوور خەی!!

سەعدی لەو بەشەدا ئەوەمان وە بیر دێنێتەوە کە ئینسان لە وەختی ئاسایش و ئاسودەییدا قەدری ئاسودەیی نازانێ. کەسێك نیعمەتی تەندروستی درك دەکا، کە بە دەردو نەخۆشیەوە گرفتار بوبێ, نەخۆشێك کە شەوێ تا سەحەر بە دەردەوە دەناڵێ و بێدارە, درێژی شەوێ دەزانێ.

هـیچ کەس قـــــەدری ڕۆژی خۆشیێ نـــازانێ

مەگین ئەوێ ڕۆژێ بکەوێتە سەختی و نـاخۆشییێ

کـــەسێك قـــــــەدری لـــەشســـاغی دەزانێ

کە ڕۆژێك بێچارە تـــــوشی نــۆبەتێ بــــوبێ

ئەتۆ کوا شەوی درێژ بە تاریکی دێتە پێش چـاوی

لــەبـەر خەو خۆشی، کوا دەکەی کەلەکەو کەلـەکێ

بـــــــڕوانە ئــــــەو نــــەخۆشەی نۆبەتێی لێیە

هـــــەر دەردەدار دەزانی درێژی شـــەوێ چەندەیـــە

بــــە دەنگی دەهۆڵێ میری مەزن وەخـــەبەر بـــێ

چۆن تێپەڕینی شەوی پاسەوان لـە کـوێ دەزانـــێ







## زمانی فێرکاری سەعدی

ئێمە دەزانین کە هیچ وتارخوێن و گوتەبێژێك بە ئەندازەی سەعدی لە فێرکاری زوبانی فارسیدا جێ پەنجەی نیە, لە ڕاستیدا زمانی فارسی زمانی سەعدیە. توانایی سەعدی لە ئاراستەی ئەو زمانەدا دوای حەوسەد سالْ هەمان چەشنی ئەو شێوەیە کە ئەو بونیادی ناوەو ئەوێستاش درێژەی هەیە، کە لە کەم نەتەوەدا ئەو وێنەیەی هەیە.

سەعدی سەرەڕای زمانە شیرین و سادەو ڕەوانە فارسیەکەی, کە لەو پەڕی کەماڵە, هەوڵیش دەدا پەرە بە زمانی سادە بدرێ, بەلاَم بەرز، توانای ئەو بۆ ئەو کارە گرینگە سەرکەوتنی هێناوە, لە هونەرو شێعرو وتاری خۆی دەکاری هێناوە.

یەکێ لە هونەرەکانی ئەدەبی ( جیناس )ی ناوە, واتە وشەیەك دەگەلْ وشەیەکی تر لە ڕوکەشدا یەك واتان, بەلاَم لە مانادا لێك جوێن, ئەوەش لە بەیتێکدا جێ بکرێ.

ئەو هونەرە سەرەڕای جوانی و ئارایشی وتەو شێعر, خوێنەر بە مانای دوو سەرە یان چەن مانایی وشەکان ئاشنا دەبێ، ئەو هونەرکاریە



ئەدەبیــە دەبینــێ و بــەکارهێنانی وشــە بــۆ مانــای لێــك جیــا دەناســێ و دەتوانێ بەکار بێنێ.

ســەعدی لــە چــیرۆکێکی چــوار بەیتیــدا چــوار جــار وشــەی ( خــام ) دەکاردێنێ, کە لە چوار مانادا بـەکارهاتووە. لێـرەوە خوێنـەر بـە مانـای جیاجیای وشەکە ئاشنا کردووە.

برهنه تنی یـــك درم وام كـــرد

تن خويش را كسوت خـــام كرد

بنـــاليد كـــاى طالع بد لگام

بگرمـــا پختم درين زير خـــام

چو ناپخته آمد ز سختى بجـــوش

يكى گفتش از چاه زندان خمــوش

بجاى آر اى خـــام شكـر خـداى

كه چون ما نه خام بر دست و پـاى

لـە دێـڕی یەکـەم (خـام) بـەمانای پۆشـاك لـە چـەرمی دەبـاغ نـەکراو هاتووە.لە دووەمـدا دەگـەڵ مانـای چـەرمدا, سـیفەتی خـاوی بـە بـەرگی چەرمی دەدات.

لە چوارەمیشدا (خام) بە مانای ئینسانی خاوو بێ ئەزمون هاتووە.

لـە بەشـی دووەمـی چـوارەمدا بـە مانـا ڕیشـمە و گوریسـە, کـە دەسـت و پێی زیندانیانی پێ بەستراوەتەوە.

**شوکرانە لەسەر شوکرانە بژێری**



ئەوانەی تەوفیقی شوکرانەو سوپاسگوزاری یەزدانیان هەیە، سەعدی پێیان دەڵێ: کە تەوفیقی شوکرانە هەم لە خوداوەیە, بۆ ئەوەی نەبادا بە سوپاسگوزاری خۆی مەغرور بێ و خۆی لە نێو ساڵحاندا بژمێرێ. شوکرانە نیعمەتێکە سوپاسکردنی دەوێ.

**بەشی نۆیەم: تۆبەو ڕێی ڕاست**

لەو بەشەدا کە نزیکە بە کۆتایی سەعدی نامە, وەك هەر کۆن ساڵێك پێویستە تۆبەی بکاو بەرەو خودای خۆی بگەڕێتەوە, لەوەی بە خافڵی گوزەراوە پەشیمانی دەردەبڕێ. سەعدی لە کۆتایی فەسڵی کتێبەکە بە تۆبەکردن و ڕووکردنە هەق تەعالا ئامۆژگاری دەکات.
یەکەم بەیتی ئەو بەشە ڕووی لە ئینسانی حەفتا ساڵە، پێدەچی لەو بەیتەدا سەعدی لەگەڵ خۆیدایەو ڕووەو خۆی دەدوێ.

بیا ای کە عمـــرت بـــە هفتـــاد رفت
مگر خفتە بـــودی کـــە بـــر بـــاد رفت

وەرە ئەی ئـــەو کەسەی گەیشتویە حەفتا
مەگین نوستبووی تەمەنت ڕۆیشت بە بادا

بە ورد بونوە لە ئەو بەیتەو ئەوەی کە سەعدی مێژووی هەڵبەستن و سرودەنی بۆستانی لە ساڵی ٦٥٥ ك دەربڕیوە:

ز ششصد فزون بود پنجاە و پنج
کە پر در شد ایـن نامبردار گنـج



لێرەوە هێندێ لە توێژەران گەیشتونەتە ئەو ڕایە کە کە سەعدی لە زەمانی نوسینی بۆستانێدا حەفتا ساڵ بووەو لە بەرانبەرکردنی ئەو دوو مێژوویەش دەکرێ بڵێین لە دایك بوونی سەعدی لە ساڵی ٥٨٥ کۆچیدا بووە.

دەستپێکی بەشی نۆیەمیش بەو بەیتانە دەست پێدەکات:

وەرە ئەی ئەو کەسەی گەیشتویە حەفتا
مەگین نوستبووی تەمەنت ڕۆیشت بە بادا
هەر کەس تەمەنی خۆی بە خۆڕایی لە دەست بدا
بە بێ کار بردی و زێڕی وە دەست نەهێنا
هەر خەریکی ژین و دەوڵەمەندی بووی
قەت لە تەکبیری ڕۆیشتن نەبووی
لە ڕۆژی قیامەتێ کاتێ بازێڕی بەهەشتێ دادەنێن
بە گوێرەی کارو کردەوە خەڵکی وە ژووری دەنێن
چەندت پێ بێ ئەوەندەی وە دەست دێنی
خۆ موفلیس بی، بەس شەرمەزاری دەبینی
بازاڕ هەرچەند لە کاڵاو کەلوپەل ئاخنرابێ
باخەڵ بەتاڵ دڵی هەر پەرێشانتر دەبێ
ئەگەر لە پەنجا دیرەم پێنجی ون بێ



دڵت زامـــــداری ســــەرپـەنجـەی خـــەم دەبێ

گەر پەنجا ساڵی تەمەنت بە خـۆڕایی لەدەست ڕۆیی

ئـــــەو پێنـــج ڕۆژەی مـــاوتە بــە هــەلی بــزانە

ئـــــەگـــــەر مـردوی بـــێ چـــارە زمـــانی هەبا

ئەوا بــە جارێ دەكـــەوتە نـــاڵە و هـــات و هەرا

هۆی ئینسانی زیندوو! کە توانات هەیە لە قسەکردنێ

لێوت لـــە یادی خودا وەك مردوو لەسەرەك دامەنێ

ئـــەگـــەر ئێمەی مردوو بە خافڵیمان ڕۆیشت ڕۆژگار

ئـــەتـــۆ ئـــەو دەمەی مـــاوتە بـە دەرفەتی بژمار

******





**جوانی و جحێڵیش کاتی خۆی هەیە**

**سەعدی لە بوخچەی بۆنخۆشی خۆیدا پێچەوانەی زۆرێ لە ماموستایانی پەروەردەی کۆمەڵگا، کە زیاتر ڕوویان لە گەنجانە، پیرو بە ساڵداچووش ئامۆژگاری دەکات، دەخوازێ ئیتر جحێڵی نەکەن، هەر قۆناغ و ساڵێك دەورانێکی تایبەتی هەیە، شلکی و لاویی لە پەلکە گەڵی تازە دەبینرێ، نە ئەو کاتەی زەرد و سیس هەڵدەگەڕێ و ڕەشەبا بە خڕو دۆڵانیدا دەفڕێنێ.**

**چو بـــاد صبـــا بـــر گلستـان وزد**

**چمیدن درخـــــت جـــوان را سزد**

**چمد تا جوان است و ســـــر سبز خوید**

**شکسته شود چـــون بـــــه زردی رسید**

**بهاران کـــــه بیـــد آورد بید مشك**

**بـریـزد درخــــــت کهـن بـرگ خشك**

**کە بای سەبا دای لەو بـــاخ و گوڵستانە**

**لەنجەو لار لە داری گــەنج و لاو جوانە**

**تـــا نـــاســـك و شـینـە دەلارێ**

**خۆ کـە زەرد و سیس هەڵگەڕا بە لادا دێ**

**بەهاران کە شەماڵ بۆنی خــــۆش دێنێ**

**درەختی جحێڵ گەڵای وشك هەڵدەوەرێنێ**



**چیرۆکی پیرێ دەگوازێتەوە, کابرا دەچێتە لای دکتۆر, لە سستی و بێهێزی عەرزی حاڵ و شکایەتیەتی.**

**جەنابی دکتۆر هاتووم دەرمانی حاڵم بکەی**

**بیری چارەیەکم بۆ بکەی**

**دکتۆر گوتی: تازە دەورانی چستوو چالاکی و توانات کۆتایی هاتووە.**

**پیرە پیاوێك بە هانکە هانك هاتە لای دکتۆری**

**لە تاوێ نازارێ خەریك دەبوو بمری**

**دکتۆر دەماری دەستم چاك بگرە پێم نایەتە ڕۆینێ**

**دکتۆر وتی: وەختی نەما دەست بەردە لە دنیایێ**

**تازە ڕۆیی مەگین ڕۆژی پەسلانێ پێت بێنە ڕۆینێ**

**ئەگەر چاخی لاویت بە گاڵتە و گەپ بەسەر بردووە**

**ئەوێستا ئەو تەمەنە بە چاکە قەرەبوو بکەوە**

**جەنابی خاڵۆ ئەگەر تەمەن لە چلێ ساڵی سەرکەوێ**

**تازە دەست و پێیان لێمەدە و پەلەقاژەت نەبێ**

**خۆشی ئەو وەختە لە من دوور کەوتۆتەوە**

**دکتۆر پیریم هاتۆتە ڕێ و شەوم سپی بووە**

**دەبێ هەوەسی دەورانی جەوانی لە سەرم دەرکەم**

**خۆ تازە بەزمی لاوی و گاڵتە بەسەر چووە**

**بە تەماشای سەوزەو شیناوەرد کوا دڵم خۆش دەبێ**

کــە خەریکــە گیـــا لــە ســـەر گۆڕەکەم شین دەبێ

لە گــەشت و گەڕان بە سەر گۆڕی زۆراندا تێپەڕیم

کەسانێکیش کە وێستا نەهاتوون و لەمەو دوا دێن

بــە نۆبەی خۆیـان بــەســـــەر گلکۆی ئێمــەدا دێن

حــەیفێ وەرزی جـــــــەوانــی بـــەســـــەر چــوو

یـاری و گـاڵتەی ژیـــن هـەمووی بــە بــــادا چوو

دوای ئــەوەی ســەعدی لــەو بەشــەدا پــیران دەدوێنــێ و ڕووی قسـەی لەوانەو وەختی کۆچ و ماڵ پێچەوانەیان وە بیر دێنێتـەوە، ئینجا ڕووی خۆی بۆ لای گەنجان دەسوڕێنێ و ئەوانیش کە هەر لەسەر ئـەو ڕێیـەن، ئامۆژگارییان دەکـات، تـا پـیر نـەبوون ڕێـی بەنـدەگی وەك پـیران بگرنـە بەر، کات و قۆناغەکانی ژیان لەدەست نـەدەن، لـە هێـزو توانـای گـەنجی خۆتان بەهرە وەربگرن، نەکەن تەمەنتان بە بێ ئاگایی بڕوا.

گەلی لاوان ! ڕێی خودا پــــەرستی بگـــرنە بــــــــــەرێ

سبەینێ کە پیر بووی تاقەتی گەنجی لە پیری دەستناکەوێ

هـەر لـەو بەشـەدا سـەعدی بـە زمـانێکی شـیرن و خـۆشێ، بـە مەبستی تۆبـەو گەڕانــەوە چـەندین چیرۆك لـە باسـی فـەنای جیهـان و ئینسـان دێنێ، کە بێ ئەرزشی جیهـان بـە گـوێی دڵدا دەخـوێنێ و بڕۆینـە سـەر ڕێی حەزرەتی هەق.



لەو چیرۆکەی خوارێ باسی جەمشید دەکات، کچێکی نازەنینی دەمرێ، دەستور دەدا کفنی کیژۆڵێ لە ئاوریشم بدروێ، هەروەك کرمی ئاوریشم، ئاوریشمان تێوە پێچا، لاشەی کیژۆڵەیان بە خاك سپارد. دوای چەند ڕۆژ دەچێتە دیداری، گۆڕەکەی هەڵدەداتەوە، دەبینێ کرمەکان کفنی ئاوریشمیان ئاوەڵە کردۆتەوەو زەرد هەڵگەڕاوەو خەریکە دەڕزێ.

جەمشید کیژۆڵەیەکی نازەنینی مرد
کفن و خەڵاتی لە ئاوریشم بۆ کرد
دوای چەند ڕۆژان ڕۆیشتە گۆڕستان
تا بۆی بکا شین و ڕۆ و گریان
کە چاوی بە کفنی کەوت چۆن ڕزاوە
جەمشید کەوتە فکر و خەیاڵاوە
گوتی ئەو ئاوریشمەم بە زۆر لە کرمی هەستاند
کەچی کرمی قەبران بە زۆر لێیان ستاند
ڕۆژێ دو بەیت شێعرم بیست جەرگی کردمە کەباب
گۆرانی بێژێك بە سازەکەی دەیگوت
حەیفێ لە دوا ئێمە ڕۆژ و ڕۆژگار تێدەپەڕێ
گوڵ دەڕوێن و خونچە دەپشکوێ
زۆر مانگی پوشپەڕو بەفرانبارو گوڵان دێن و دەڕۆن
ئێمەش لە بن خاکێدا گڵ و خۆڵ



هەر لەو بەشەدا سەعدی دوو چیرۆکی دەورانی منداڵی خۆی دەگێڕێتەوە، کە ئامۆژگاریەکانی بۆ لاوان بۆ پەرهێزکاری لە غەفڵەتی منداڵی و جحێڵی کاریگەرترە.

لەو چیرۆکەدا دەڵێ: کاتێ منداڵ بووم بابم تەختەو دەفتەری ڕاهێنانی دەرس و ئەنگوستیلەیەکی زێڕینی بۆ کڕی بووم، بەد کارێك بە دنکە خورمایەك ئەنگوستیلەی لە دەست دەرێنام، چون ئەو وەختی قەدری زێڕو قیمەتەکەیم نەدەزانی، کەسێك کە تەمەنی خۆی بە بێ هودە خەرج دەکا، قەدری وەخت و تەمەن نازانێ، کە لە زێڕ بەهادارترە.

لە زەمانی بابم وەبیرم دێ
بارانی ڕەحمەتی لەسەر بێ
تەختە و دەفتەرو ئەنگوستیلەیەکیشی بۆ کڕیم
ناگا موشتەریەك ئەنگوستیلەکەی
بە مستێ خورما لەدەست دەرێنام
ئەگەر منداڵ قیمەتی ئەنگوستیلەی نەناسی
بە شیرنیەکی کەم دەتوانی لێی بستێنی
کە تۆش باخی تەمەنت نەناسی
لە ڕابواردنی ژینی شیرین لە دەستی دەدەی



**لە چیرۆکێکی تردا گەنجان ڕێنمایی دەکات، کە دەست لە دامێنی پیران بەرهەڵنەدەن. ڕێی ژیان لە ڕێ ناسان بناسن و ڕێ بەرنەدەن، تاکو گومڕا نەبن.**

**هەر لە بیرمە لە هەڕەتی منداڵیدا بووم**
**جێژنێ چوومە دەرێ دەگەڵ بابم**
**وێڕای خەڵکی سەرگەرمی یاری و گاڵتە بووم**
**لە نێو حەشیمەتدا لە باوکم هەڵبڕابووم**
**لە ترسان هاوارم کرد یەك بەخۆم**
**لە پڕ باوکم گەیشتێ و گوێی بادام**
**هەی بێ شەرم ئاخر چەند جار پێم گوتی**
**دەستم لە داوێن بەرمەدەو هەڵمەبڕێ**
**چوون منداڵی بچووك شارەزانیە**
**خۆ بە تەنێ ناتوانێ ڕێ ببڕێ**

*****





## کۆتایی بۆستان

## بەشی دەیەم: موناجات

**حەزرەتی سەعدی بۆستانەکەی بە جوانترین وشەو هەست و کـوڵ بـۆ زاتی هەق بـە کۆتـا هێنـاوە، ئێمـەش لێرە بۆنخۆشـوەك بۆنخۆشکردنی باسـەکەمان چـەند بەیتـە موناجاتێـك دەکەینـە کۆتـا بەشـی باسـی بۆستانێ..**

**وەرە با پێکەوە بە حزوری دڵ دەست بەرز کەینەوە**
**چونکە ناتوانین سبەینێ لەنـاو گـڵدا بپـاڕێینەوە**

**نـــابینـی وەرزی خـــــەزان و دار و دەوەن**
**لـــــە سەرمان چۆن بێ بــــەرگ دەکرۆزێنەوە**

**دەستی نـاتـاجیت بــەرەو خــودا بـــەرز کـەوە**
**رەحمی خوا بە خاڵی و ناهومێدی نایگەڕێنێتەوە**

**وا فکر مەکـە، هەرگیز ئەو دەرگــایە کەڵێ نەدراوە**
**دەستی ڕاز و نیـــاز هیوا بـڕاو نـــاگـەڕێنێتەوە**



خــــودایه بـــــه لــوتف و کەرەم لێمان بڕوانه
هەر لـــــه نێمەوەیە ئـــەو هەموو هەڵە و تاوانه

له بەنـــدەی دامــاو گـونـاح و تـــاوان ڕوو دەدا
هــومێدی عەفوو چــاوەڕێین لـــه تـۆ نەی خودا

خـودایــه بــه نــان و بـــژێـوی تۆ پێگەیشتووین
بـــه نیعمەت و لـــوتـفی تـــــۆ خوو گرتووین

سـوالکەر کـــه چاوی له سەخی و لـوتف و ناز بێ
ئیدی بـــه دوای بـــەخشندەیەکـی تردا ناگەڕێ

خـــودایـــه بۆ خـاتـری گەورەییت داماوم مەکه
به هۆی گوناح و تـــــاوانــەوە شەرمەزارم مەکه



# عەقڵ و عیشق [25]

د: غولام حوسێن دینانی

**بـــە تـو حاصلی ندارد غم روزگار گفتن**
**کە شبی ندیدە باشی بە درازنــــــای سالی**

**غەمی ڕۆژگار گوتن بۆ تۆ نیەتی سودێ**
**کــــە بـــە درێژایی ســاڵ شەوێك نەتدیبێ**

**چ شـتێك دەکـرێ لـە عـەقڵ و عیشـق خـاڵی بـێ؟ چ ڕەهەنـدێك، یـا فەزایـەك لـە فـەزاکانی وجـودی ئینسـان گـرینگتر و هەمەلایـەنترە لـە عـەقڵ یـا عیشق، یـا هـەردوکیان پێکـەوە؟ لەڕاسـتیدا گرفتـی بنـەڕەتی لێرەوە سەرهەڵدەدا.**

**هیچ شکی تێدا نیە کە شێعر گەورەترین جیلوەی هونـەری ئادەمییـە و هیچ گومانیش هەڵناگرێ کە سـەعدی لـە گـەورەترین شـاعیرانی فارسـی زمانی جیهانە، بۆیە پێویستە بـەو دوو پێشـەکیە بڵـێم کـە سـەعدی لـە فەزای ئەدەبی فارسیدا گەورەترین هونەرمەندی جیهانە.**

**شـێعر، بێجگـە لـە عـەقڵ و عیشـق سەرچـاوەیەکی تـری نیـە. نـازانم کانگای شێعر عیشقە یا عەقڵ یا هـەردوکیان؟ شـێعر لـە شـعورە یـا نـە؟**

---

[25]. وتارێکی فەلسەفی دکتۆر غولام حوسێن دینانی لە ساڵوەگەری لەدایك بوونی سەعدیدا، لەمەڕ بیر و نەندێشەی سەعدی_ سایتی مرکز سعدی شناسی_ زیادکردن و وەرگێڕان: وەرگێڕ



**ئەگەر شێعر لە شعورە، کە هەیە، ئەڵبەتە پێویستە بە ئەقڵ و ئیشق کۆتایی بێ و دێ. پێوەندی عەقڵ و عیشق، چیەتی و ماهیەتی عەقڵ و عیشق بەتایبەتی لە زمانی سەعدیدا لەو ڕووەوە موشکیلتر دەبێ، چونکە ئەگەر بمانەوێ عەقڵ و عیشق بە شرۆڤەیەکی ئەقلانی شەن و کەو بکەین، بابەتەکە دەگۆڕێ و مەزنیەتی سەعدی بەو لێکدانەوە و شیکاریە دوچاری خەسارەت و کەمایەسی دێ. بۆناسینی عەقڵ و عیشق پێویستە لە ڕووی مەعریفەت شوناسیەوە لێکدانەوە و کۆڵینەوە ئەنجام بدەین.**

**وەلێ ئایە عەقلانیەتی سەعدی و مەعریفەتی سەعدی یان هەر شاعیرێکی تر دەکرێ جودا لە زمانەکەی کۆڵینەوە و شرۆڤە بکەین؟ ئەو کارە کارێکی زۆر مەترسیدارە، ئەگەر بمانەوێ بە ئەندێشەی سرفی هەر شاعیرێك کیفایەت بکەین، ئەندێشەکانیان بەبێ لەبەر چاوگرتنی هونەری زمانی ئەو، توێژینەوە بکەین، لەو حاڵەتەدا مەقامی بەرزی وی زۆر دێنینە خوارێ، پێویستە دان بنێم کە هەر شاعیرێك هەر پلە و مەزنیەتێکی هەبێ، بەبێ لەبەرچاوگرتنی زمانەکەی هیچ ئەندێشەیەکی نوێی تێدا بەدی نایەت.**

**لەلایەکی ترەوە ئەگەریش بۆ توێژینەوە تەنێ چاومان لەسەر زمان و وشە و ڕستە و ئەو لێکدانانەی بەکاری هێناون بەشێوەیەکی گشتی کەلامی شاعیر لە ڕووی زمانناسی، بێ لەبەرچاوگرتنی ئەندێشە و خەیاڵی ئەو، دیسان توشی هەڵە دەبین، چونکە بە تەنیا دانانی وشە لە کەناری یەکتریدا شتێك نیشان نادا، هیچ هونەرێك نمایش ناکا.**



لەو وێنەیەشدا ئەگەر بەو جەشنە بچینە شیکاریەوە دەپرسین ئاخۆ ئەو هونەرە بێ وێنە سەرسوڕێنەر و سحرە کاریگەرە لە درێژایی چەرخ و سەردەمەکاندا چۆن چۆنی پەیدا دەبێ؟

لەڕاستیدا ئەو هونەرە هەڵقولاوی هەمان ئەندێشە و بیر و هزرەیە کە کراوەتە وشە و بە زمانی سەعدی دەربڕاوە و هاتۆتە گۆ.

شیعر و ئەندێشەی سەعدی لە وتە و وشەکانیدا دەرکەوتووە، ئەندێشەی سەعدی لە وتە و کەلامیدا دیارە و لە ئەوجی خۆیدایە. لەڕاستیدا بەیانکردنی ئەندێشەی سەعدی بەو پاراوی و پێز و ڕەوانیە غەریبە فرە سەختە.

ململانێی عەقڵ و عیشق نیزاعێکی دێرینەی مێژوویيە، هەتا پێش فەرهەنگی ئێمەش کە فەرهەنگی ئیسلامیە، هەبووە. لەوەتای مرۆڤ بوونی هەیە ئەویش هەیە. بەرجەستە ترین فەزای وجودی ئینسان عەقڵ و عیشقە، لەو دوو فەزایە بالآترمان نیە، ئەو دووانە لە ئەوج و بڵێندایدان. هیچ شتێ لە عەقڵ بالآتر نیە، هەروەتر هیچ شتێ لە عیشق هەم بالآتر نیە، بەلآم لە نێوان ئەو دوانەدا کامیان بالآترە، لەوەدا جێگەی قسە لەسەر کردنە، بەڵێ ئەو دوانە بالآترینن، بەلآم ئەو دوانە چ پێوەندیەکیان لە نێواندا هەیە؟ ئایە پێوەندیان تەبایی ئامێزە یان لە جەنگدان؟

کاتێ دەڕوانینە میرات و کەلەپوری ئەدیب و شاعیر و عاریف و گەورە ئەدیبان بە فراوانی قسە گوتن بە عەقڵ و ناتەبایی دەبینی، عەقڵ وەکو دێو و نافەتێك لە شێعری شاعیرانی ئێمەدا دەبینرێ.

عەتاری نیشابوری کە پێگەیەکی کەمی نیە و یەکێکە لە گەروە پیاواتی عیرفانی و عاریفی مەزنی ئێمە، کاتێ دەگاتە عەقڵ و



فەلسەفە دەکەوێتە پرتە و بۆڵە و سەرکۆنەکردن، بەتایبەت بۆڵەی فەلسەفە، بۆنمونە دەڵێ:

**کاف کفر ای جان به حق المعرفه**

**خوش تـــــرم آید ز فاء فلسفه**

دەزانی دەڵێ چی؟ کافی (ك) وشەی کوفر (کفر)ی لە فێی (ف) فەلسەفە لە قالبی خۆشتر دێ، بەلایەوە چاتر و پەسند ترە، کافی کوفر زۆر باشترە لە فێی فەلسەفە.

چونکە ئەو زانستە کە سەر گێژەی پێومیە، بەلأم هەرچەند بڕواتە پێش و هەنگاو هەڵێنێ خەڵکی وشیار تر دەبێ.

پێویستە بپرسم کە تۆ قسە بە کام عەقڵ دەڵێی؟ عەقڵ چیە و چ پێناسەیەکت بۆی هەیە؟ ئەی عیشق چیە؟ چ پێناسەیەکت بۆ عیشق هەیە؟ لێرەدا ئەگەر بمەوێ قەزاوەت بکەم پێویستە شرۆڤە و شیکاری بکەم.

**عیشق چیە؟**

مەگەر دەکرێ پێناسە بکرێ؟

مەولانای عاشق و عاریفی مەزن فەرمویەتی:

**عشق آنست کو چـــــون بـــــر فـــروخت**

**هرچە جز معشوق بــــــاقی جمله سوخت**

**عیشق ئەو پۆلوە ئاگرینەیە هەرکات داگیرسێ**
**بێجگە لـــە مـەعشوق هەموو شتێ دەسوتێ**

عیشق ئەوەیە، هیچ شتێك نایەڵێت، هەموو شتێ گڕ دەدا و دەسـوتێنێ، مۆم و پەروانەی عاشق هەردووك دەسوتێن.
موحیبـەت جیهـانی غـەیبی " الســت _ ئایـە مـن " سەچـاوەیەتی و هەمیشە لەوێوە دێ، ئـەو جیهانـەی کـەمتر نـاوڕی وێ دەدرێ، کـە یـەك لە ڕوکنی ئەساسی کاری عاریف و شـاعیرانی ئێمەیـە، جیهـان یـان ڕۆژی " ئەلەست " غەیبی و پەنهانە، ئەو ڕۆژەیە کە خودا بۆ گەواهیـدان بـۆ یـــەکتایی پەروەردگاریـــەتی و زاتـــی هـــەقی پـــەیمانی لـــە ئینســـان وەرگرتووە.
﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰ أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَا ۛ أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَافِلِينَ. الأعراف ١٧٢﴾
واتا: ئەوساش کە پەروەرەندەی تۆ لە پشتی عـەولادی ئـادەم زاروزیچی بەرهـەمهێنا، لەسـەر خۆیـان شـایەتی هـەر بـە خۆیانـدا. گـوتی: مـن پەروەرێنتـان نیم؟ گوتیان بەڵێ، ئێمە لەوە ئاگادارین. نـەکا ڕۆژی سـەلا بێژن نەمانزانی.
جیهـانی " الســت " ڕۆحـی ئـەو جیهانەیـە، ئـەو ڕۆژە زەمانێـك نیـە تێپەڕیبێ، ئەو پەیمانە ئێستاش هەر هەیە و بەردەوامـە، ئـەو ڕۆژە بـان زەمەنـە، ئێسـتایە و ئایندەشـە، هـیچ کاتێـك خـاڵی نیـە لـەو پەیمانـە، هەمیشە حزوری هەیە و هەمیشە موحیبەت لەوێوە دێ.



خوب، ئێستا عەقڵ لە کوێ ڕا دێ ؟ پرسیاری بنەڕەتی ئەوەیە. کاتێ لە ڕۆژئاواییەك دەپرسی لەوەڵامدا دەڵێ خۆم عەقڵ دروستدەکەم، بەدی دێنم، بونیادی دەنێم، دەشڵێ: عەقڵ لە پرۆسەیەکدا بۆمن دێتە بوون، ئەوە خۆمم دەیهێنمە بوون، وەگەرنا عەقڵێك دەگۆڕێدا نیە.

مەلا سەدرا _ صدر المتالهین _یش، لە هەمان جێ ڕا دەست پێدەکات، بەڵام نەك بەشێوەی ڕۆژئاوایی، کاتێ مەلا سەدرا نەفسی جسمانیەت بە پەیدا بوو دەزانێ، ئەوە یەعنی چی؟

واتا: ئینسان لە هەوەڵی لەدایك بوونی تەنێ جسمە، لاشەیە و بەس، نەفس و ڕۆح لە دیدی مەلا سەدرا درۆیە، خەتێکی بەسەر بۆچونی هەزار ساڵ پێشدا کێشاوە، بەسەر ئایەتی " ونفخت فیە من روحی " وە " مورغی باخی مەلەکوتم " خەتێکی بوتلانی بەسەردا کێشاوە و دەڵێ: ئەوە مەعقول نیە، ناچێتە ئەقڵەوە و ئەقلانی نیە.

بۆچونەکەی مەلا سەدرا عەقلانیە، ئەو دەڵێ: جسم و لاشەیە، بەڵام نەك وەکو ڕۆئاواییەکان کە بڵێ خۆم دروستی دەکەم و سازی دەکەم، بەڵکو دەڵێ: کاتێ من پێگەیم و ئامادە بووم، عەقڵیش دێت، فیوزات دێ و دەڕژێتە ناوی. بەهرەکان دێن. لە بۆچونەکەیدا جیهانی غەیبی بەرجەستەیە و هەست پێدەکرێ، بەڵام ڕۆژئاواییەکان جیهانی غەیب ناناسن، ئەوان دەڵێن: عەقڵ دروست دەکرێ، ئەوەش ئەو عەقڵەیە کە کافی کوفری عەتار لە فائی فەلسەفە باشترە.

بەڵام عەقڵێك کە " اول ما خلق الله العقل " یان " اول ما خلق الله نوری " واتا نوری حەزرەتی خەتمی مەرتەبەت، خۆ ئەگەر هەر دوو ڕیوایەت وەربگرین و کۆبکەینەوە هەردوکیان پەسندن، واتا عەقڵ هەمان نووری موحەمەدییە.



ئاخر جێیەك عەقڵی لێ نەبێ، چی هەیە؟ تۆزێ ڕامێنە. ئەگەر عەقڵ نەبێ چۆن چۆنی حوكم دەدرێ، ئەسڵەن حوكم و بڕیارێك نابێ، بڕیاردان كاری ئەقڵە و ئەقڵ خاوەنداریەتی دەكات.

ئەگەر ئەقڵ نیە حوكمیش نیە، ئەگەر ئەقڵیش نەبێ حوكمدان بە نەبوییش دیسان دروست نیە.

تەواوی ئەو عەقڵانەی كە لەبەشەریەتدا دەبینم، جیلوەیەكە لەو عەقڵە، ئەسڵەن عەقڵ چەندایەتی نیە، ئەگەریش چەندایەتی گوترابێ بێگومان دابەشكاری پلەبەندیان كردووە بەڵام نەك جیاوازی و ناكۆكی و لێك جیا. عەقڵەكان لێك جوێ نین، بەڵكو پلەبەندی و باڵای و نەوییان هەیە، هەموو عەقڵێك جیلوەیەكە لە عەقڵی ئەو، بۆگەیشتنیش بەو عەقڵە پێویستە هەوڵ بدرێ، حەزرەتی خەتمی مەرتەبەت هەمان عەقڵە كە دابەزیوە و هەم سەركەوتووە. حەزرەتی خەتمی مەرتەبەت عاقڵترین مەوجود و مرۆیە، كە لەو گەردونەدا هاتۆتە بون و دێ، چونكە حەزرەت عەقڵی هەمەكیە " عقل كل " و عاشقترین عاریفە كە هاتۆتە دنیا و لە ئەوانەشی لەوەو دوا دێن. ئەوێستا بپرسین ئاخۆ عاشقترینێك لە خەتمی مەرتەبەت كەسێكی تر پەیدا دەكەی؟ ئەی عاقڵترین كێیە؟ ئێستا عەقڵ و عیشقی حەزرەت لە جەنگدان؟ عەقڵ و عیشقەكەی لێك لە بەهانەمن؟ نەخێر نەوەڵا، لە وجودی ویدا هیچی لە هیچی لە شكایەت نیە، تەواوی وجودی حەرەت سوڵح و ساڵحی و ئاشتی هەمەكییە، ئەوەندە كامڵە تەواوی بەش و خەسڵەتەكانیشی لە جێی خۆیاندان و كامڵن.

تەواوی عاریفان بە ئەندازەیەك بۆڵەی عەقڵیان كردووە. باشە، ئێستا فەیلەسوفان شتێكیان گوتووە، تۆش دەڵێی فەلاسیفەكان زۆر



مەغرورن، دەگونجێ وابێ، بەڵام من پێموایە عەقڵ مەغرور نیە، ئەگەریش عەقڵێك مەغرور بوو عەقڵ نیە، چونکە خاکیترین مەوجودی عالەمی هەبوو عەقڵە، بۆچی؟ عەقڵ تەنها مەوجودێکە کە لە سنوری خۆی تێدەگات، هیچ هەبوویەکی تر لە سنور و بازنەی خۆی تێبگات، عەقڵ هەم خۆی دەتوانێ تێبگا کە سنور دارە هەم سنوری ئەوانی تریش، تەنها هەبویەکە ئاگای لە سنورەکەی خۆیەتی و دەڵێ ئەوەندە سنوری منە و ناتوانم بالآتر بڕۆم، نور و ڕۆشنایی تەجەلی دەمسوتێنێ، لەبەر ئەوە سادە و خاکیترین مەوجودی گەردون عەقڵە. خۆ ئەگەر فەیلەسوفێك یا ئادەمێکی عاقڵی غرورت بینی، بزانە کە هەواو هەوەس ئەقڵی زیندانی کردووە.

قسە گوتن بە عەقڵ لە ئەدەبی ئێمەدا پێشینەیەکی دێرینی هەیە، سەعدی تەنیا کەسێکە کە لە ئاسار و میراتەکەیدا کەمترین ئەو کێشمەکێشە دەبینرێ یان ئەسڵەن هەر نیە.

هیچ کاتێ لە مەقامی عاشقان و عاریفیدا قسەی بە عەقڵ نەوتووە و هیچ کاتیش بە عینوانی عاقڵێك خۆشەویستی و موحیبەت بە کەم نازانێ و ناڕوانێ. سەعدی لە کەماڵی هاوسەنگی و ئارامیی بەهاریدایە، ئەسڵەن میزاجی سەعدی بەهارییە، میزاجێکی نەرم و میانڕەو و ئارامە، لەوپەڕی میانڕەوی فیکریدا کارەکانی دەگەیەنێتە ئەوجی خۆی، سەعدی گەردونی و دەرەکیانە دەفکرێ، وەلێ بەو مانایە نیە کە لە دەرون غافڵ بێ. لە ڕاستیدا هونەر ئەوەیە کە دەرەکی و ناوەکیانە بفکرێ و هاوسەنگی و میانڕەو بێ، قسە بە عەقڵ ناڵێ، هەموو کات قسە لەگەڵ عەقڵ دەکات، ئەگەر لە جێگایەکدا بڵێ:



ره عقل جـــــــــز پیچ در پیچ نیست
بر عـارفـــان جـــز خـــدا هیـــچ نیسـت

ڕێی عەقڵ بێجگە لە خوار و خێچی چیتر نیە
لەلای عاریفان بێجگە لە خـــودا هیچی تر نیە

بەلأم بۆخۆی خەریکە لێـرە سوغرا و کوبرای یاسـای مـەنتیقی دیـاری دەکـات و ئـەو یاسـا ئەقڵیـە دێـنێ، ئـەوەش بۆخـۆی عەقلأنیەتـە. ئنجـا دواتر هەر لە کۆتایی هـەمان مەسـنەویەدا زۆر بـە ئـارامی و عاقلأنـە و خودی وەحدەت بە عاقلأنە تەرح دەکات:

چو سلطان عــــــــزت علم بـــر کشد
جهان ســـر جیـــب عـــــدم بـر کشـــد

ئەگەر خودای مەزن ئالأی گەورەی خۆی هەڵکا
جیهان سەری لـــــە بـــرۆکی نەبوون دەنێت

ئەو دێڕە شێعرە وەلأمـی هـەمان ئـەو کەسانەیە کـە نـاتوانن تێبگـەن و عەقڵیان پێچا و پێچە. دیسان ئـەو دێـڕە عـەینی عەقلأنیـەت و عیرفـان و عیشقە، هەم عیشقە و هەمیش عەقڵ. ئەو مامنـاوەنجی و میانڕەویـە کـەمتر لـە شـاعیر و عـاریفی تـر مبینـرێ، هێنـدێ لـە عاریفـان ئەوەنـدە سەرمەسـتی عیشـق دەبـن حەلاجانـە سـەریان لـە دار دەدەن، هەڵبـەت ئەوەندەی سەعدی حەلاجیشم خۆشدەوێ.

ئـەو خاڵـەش بڵـێم ئـاخۆ بۆچـی سـەعدی لـە وتەکانیـدا میـانگیری و نێوەندی هەیە؟



**سەعدی زیاتر پشت بە عەقڵی کرداری دەبەستێ، کەمتر لەگەڵ ئەقڵی ئەزەری سەرو کاری هەیە، عەقڵی سەعدی عەقڵی کرداریە، عەقڵی کرداریش ژیانە، شەریعەتە، کۆمەڵگایە، سیاسەتە، پێوەندی ئێمە بە خەڵکە، پێوەندی دەگەڵ خودا و هەمووان..**

**عەقڵی کرداری پێویست و ناپێویستە، پێوەندی مرۆڤە دەگەڵ خودا، خەڵك و خەڵك، عەقڵی ئەزەری کاری بەسەر کردارەوە نیە، حەزتکرد بیکە و یا مەیکە، کاری بە چاکە و خراپەوە نیە، عەقڵی ئەزەری دەڕوانێ، تەماشا دەکات.**

**دواجار سەعدی، سەعدی کردار ویست و خوازە و ئەوەش یەکێکە لە ڕەمزە ئەمر و پایەدارەکانی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی ئێمە.**



# سەعدی شیرین پەیڤ [٢٦]

**د. عەبدولکەریم سروش**

**عەرزی سەلام و ئەدەب..**

**سوپاس بۆ خوداوەندی بالاّ..**

**... لە ڕاستیدا حەزدەکەم ئەو شیرینیەی لە دەستی ئەو پیاوە حەکیم و دانایەم وەرگرتووە و چێژتووە دەگەڵ ئێوەدا بەشی بکەم.. مەبەستمە لێرەدا ئەو ئەزمون و چێژ و بەهرانەی لە سەعدیم وەرگرتووە پێشکەشتانی بکەم.**

**میراتی سەعدی نۆڤیانوسێکی یەکجار گەورەی بێ بنە، بە چەشنێ وتە و وتاری سەعدی هێندە سێحر ئامێز و دلاوێز و سەرنج ڕاکێشە هەمووان کەمەند کێش دەکا و دەخاتە باوەشی دەریای قوڵی پڕ گەوهەری نابی خۆی.**

**ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەد ساڵ پێش، باسی سەعدی لە نێو شاعیران و ئەدیب و نوسەراندا زیاتر چاوی لەسەر بووە، چونکە سەعدی "افصح المتکلمین"ی بە شۆرەت پێ دراوە، لەنێو نوسین و بەرهەم و وتارەکانی**

---

[٢٦]. پوختەی دوو جەلسەی دکتۆر عەبدولکەریم سروش لە مەڕ سەعدی شیرازی، لە ژێر ناونیشانی " سعدی شیرین سخن " زیاد کردن و وەرگێڕانی_ وەرگێڕ: سایتی ڕەسمی د. سروش



خۆیاندا وته و وتاری سەعدیان بـه نمونـه هێناوەتـەوە و ڕازاندۆتـەوە و نوسینەکانیان پێ مەحکەم تـر کـردووە، ئـەوەش ئـەوە نیشان دەدا کـه خەڵکی ئێمه ئولفەتی زیاتریان بـه پـەیڤ و گوفتـاری سـەعدی هـەبووە تاوەکو شـاعیران و حـەکیمانی تـر، وەلـێ ئێستا کە ڕەفه و کتێبخانـەی زۆرێك لە ماڵەکان خاڵییه لە کولیاتی سەعدی مایەی خەمگینیە.

لە ڕاستیدا ئەو فارسیەی ئـەوڕۆ کـه قسـەی پێـدەکرێ زمـانی سـەعدیە، حەوسـەد سـاڵە بـه زمـانی سـەعدی دەدوێـین، پـێش سـەعدی ئەسـڵەن زمانی فارسی بەو چەشنەی ئەوڕۆ نـەبووە کـه دەیبینـین، سـەعدی ئـەو زمانـەی وەهـا نـەرم و بونیـاد نـاوە و ڕیشـەی دامەزرانـدووە، کـه پێشـتر ئەو چەشنه شیرینی و ڕەوانی و بەیانیەی نەبووە.

## من و سەعدی

سـەرەتای ئاشـناییم لـه ڕێگـەی جـەنابی مـەرحومی باوکمـەوە بـوو، لـه بیرمه منـداڵی قۆنـاغی سـەرەتایی بـووم، دە یـازدە ساڵ، بـاوکم دەبینـی دوای نوێـــژی بـــەیانی و موناجـــات و دعـــا و ســـەڵاوەت ســـەعدی دەخوێندەوە، گوڵستانی دەخوێندەوە، بەتایبەت بۆستان، شێعر و وتـه و غـەزەلیاتی سـەعدی بـه دەنگـی بڵنـدی خـۆش ئـەوا دەخوێنـدەوە، مـن تەنیا دەمبیست و قودرەتی تێ گەیشتنم نـەبوو، پاشـان لەگـەڵ بڕینـی قۆناغەکانی خوێنـدن و خوێندنی دەرسی ئەدەب و ئـەخلاق بـەرە بـەرە بە سەعدی ئاشنابووم و تێکەڵی بووم..

هەمیشه له یادمـه ڕۆژانـی منـداڵی بـه ئەدەبـەوە کولیـاتی سـەعدیم لـه بـاوەش دەگـرت و هـەڵگێر وەرگێـڕم پێـدەکرد، ئـارەزووم دەکـرد دڵ بـه





دەریا بدەم و شیرینی ئەو ئۆقیانوسە پڕ شیرینیە بچێژم و کەوچێك شەکری شیرین بەیانی سەعدی بنۆشم..

تا دواجار توانیم بە قوڵی پێی ئاشنا ببم و ئونسی پێوە بگرم و بچمە ناوی و عیلاقەم لەگەڵیدا گەرم و گوڕ و خۆش بوو، کە تائێستاش ئەلحەمدولیلا عیلاقەم خۆشە و حیکمەت و پەند و جوانی لێ هەڵدێنجم، گوڵستان کە یەکێکە لە مەزنترین مامۆستای ئەخلاق و ئەدەبیاتی من، کە بە مانای واقیعی گوڵسانە، کاتێ دەچمە ناوی بەراستی بیر و هزرم موعەتەر دەکات، تەنانەت بۆ دەربڕینی ئەندێشەکانم تاکو بتوانم بەهرە لە زمان و ئەدەبیات و شیرین بەیانی سەعدی وەردەگرم.

**سەعدی شیرین پەیف**

سەعدی لە چاو شاعیرانی تر تەواوی شێعر و پەخشان و غەزەلیاتی شیرین و دڵنشین و دڵ ڕاکێشە، هەڵبەت ئەوەش فەزڵ و نیعمەتێکە خودا بە سەعدی داوە، سەعدی خۆیشی درکی حەقیقەتی ئەو نیعمەتەی کردووە:

زمین بە تیغ بلاغت گرفتە ای سعدی
سپاس دار کە جز فیض آسمانی نیست
بدین صفت کە در آفاق صیت شعر تو رفت
نرفت دجلە کە آبش بدین روانی نیست



**ئەی سەعدی زەوینت وەها بە بەلاغەت داگیر کردووە ، سپاست بێ کە بێجگە لە فەیزی ئاسمانی چیتر نیە، نێوبانگی شێعری تۆ وەها ئاسۆکانی بڕیوە، ئاوی دیجلە ئاوا نەڕۆیشتووە و ڕەوان نیە.**

**سەعدی ئەوپەڕی ڕەوانی وتە و گوفتاری خۆی نەخشاندووە، هەر بۆیە زۆر بە ئاسانی دەخوێنرێتەوە و فەهم دەکرێ، دەڵێ جا لەوە ئاسانتر چیە:**

**سرو سیمینا بە صحرا می روی**
**نیك بد عهدی کە بی ما می روی**
**کس بدین شوخی و رعنایی نرفت**
**خود چنینی یا بە عمدا می روی**
**می نوازی بندە را یا می کشی**
**می نشینی یك نفس یا می روی**

**هێندە بە جوانی بە پێدەشتدا دەڕۆی**
**بەد پەیمانیە کە بێ ئێمە دەڕۆی**
**کەس بەو شێوە شۆخ و شەنگیە نەڕۆیشتووە**
**خۆت ئاوای یا بە ئەنقەست وەها دەڕۆی**
**ڕەحمێ بە بەندە دەکەی یانە دەیکوژی**
**تاوێ ڕۆ دەنیشی یانە دەڕۆی**

**تۆ بڕوانە ئەو تەرزە وتە و گوفتارە هێندە ڕەوانە، هێندە زوو دەچێتە دڵانەوە، بێ ئەوەی بتەوێ دەچیتە ژێر کاریگەری و دڵ و ئەندێشە**



داگیراوی، ئەو ڕەوانیەی کە کەلامی سەعدی هەیەتی مەولانا نیەتی، هەتا حافیز هەم نیەتی، کە جۆرێکی ترە لە گوفتاردا.

کاتێ سەعدی گوڵستانەکەی پێشکەشی سەعد کوڕی زەنگ دەکات وەبیرمان دێنێتەوە:

گر التفات خداوندیش بیاراید
نگار خانه چینی و نقش ار تنگیست
امید هست که روی ملال در نکشد
ازین سخن که گلستان نه جای دلتنگیست
علی الخصوص که دیباچه همایونش
به نام سعد ابوبکر سعد بن زنگیست

ئەگەر لوتفی خودا بباریٚ، نیگارخانەی چینی و نەخشی ئەرژەنگە، ئومێد هەیە کە نەبێتە هۆی مەلەل، خۆ گوڵستان جێی دڵ تەنگی نیە، بەتایبەت ئەو دیباچەیە، کە بە ناوی سەعدی بوبەکری کوڕی زەنگە.

گوڵستان نەك هەر مەلالەت بەخش و تاقەت پڕوکێن نیە، بەڵکە شادی هێنەر و فێرکاری نەخش و هونەریشە، ئەدەب دۆستانمان دەتوانن بڕوانن کە سەعدی چەندە کاریگەری گەورەی لەسەر زمان و بەیانی شاعیران و شێعر و پەخشانی فارسی و عەرەبی لە ئێرانێ لە دوای خۆی جێ هێشتووە.



**هاودەمی عاریفان**

خاڵێکی تر لێرەدا ئاماژە پێ بکەین، هەمیشە ئەوەمان دەخرێتەوە یاد کە فیردەوسی زمانی فارسی زیندوو کردۆتەوە و ئێمەش میراتگری ئەوین و ئەو دامەزرێنەریەتی، بەلام لەبیرمان بێ سەدەیەك دوای فیردەوسی ئەبوحامیدی غەزالی کتێبی کیمیای سەعادەتی نوسیوە، کە دەستێکی بالای لە پتەو کردنی زمانی فارسیدا بوە و هەیە، پەخشانێکی بالاّ و بێ وێنەی هەیە، حەیفە کەسانێك کە فارسی زمانن و زانستی ئەخلاق دۆستن و گەرەکن، ئەو کتێبە نەخوێننەوە، ئەو کتێبە لە ڕاستیدا کاریگەری یەکجار مەزنی بەسەر زمان و نیگا و دڵ و گیاندا هەیە، کاریگەریەکی بەرزی مەعنەوی و ڕۆحی، خاوەن ئەخلاقێکی کرداری بالاّ، پێشنیاری دۆستانم دەکەم موتالای ئەو کتێبە ئەخلاقیە نایابە بکەن. لە باتی دانیشتن لەبەر فیلم و سریالە بێ هودە و دانیشتنە کات کوژەکان لەگەڵ مەزنانی ئەدەب و ئەخلاقدا دانیشن و زیندوو بن.

سەعدی هەرچەند بە جەستە لە ژێر خاکدایە بەلام هەمیشە زیندووە، بە باشی دەتوانین ببینە هاودەمیان و بچینە ناو جیهانی ئەوان و بەهرەیان لێ وەربگرین.

**سەعدی لە دەروەی مەرزی شیرازێ**

سەعدی لە زەمەنی خۆیدا بۆ تەواوی دەور و بەری زیندوو و ناوی هێنراوە و ئەدەبیاتی ئەو دیو سنورەکانی تێپەڕاندووە، بە چەشنێ شێعرەکانی گەیشتونەتە چین و لەوێ کۆشکی شا خوێنراونەتەوە.






کاتێ ئیبن بەتوتە گەڕیدەی تونسی دێتە ئێران و شارەکان دەبینێ لەوانیش شیراز و ئنجا بۆ وەلاتی چین ڕێدەکەوێ، لەوێ لە کۆشکی شا وەکو میوانێکی گەورە میوانداری دەکرێ، کۆڕی شێعر و وتە و ئەدەبیی ساز دەکرێ، یەك لەو شێعرانەی کە لە گەشتنامەکەیدا تۆماری کردووە و لەوێ خوێندراوەتەوە هی سەعدیە:

آخر نگاهی باز کن وقتی که بر ما بگذری
یا کبر منعت می کنی کز دوستان یاد آوری
صورتگر نقاش چینی گو صورت رویش ببینی
یا صورتی بر کش چنینی یا ترك کن صورتگری

**سەعدی لە نێوان شیراز و نیزامیە**

خوب، سەعدی لە شیراز لەدایك بووە، بەلام لە دانیشگای نیزامیە دەخوێنێ. دوو چەرخ پێش سەعدی غەزالی کە گەورەترین مامۆستای کەلامی و ئەخلاقیە، ئوستادی نیزامیە دەبێ، کە بێگومان کاریگەری عیرفان و ئەخلاقی غەزالی بەسەرەوەیە و قوتابخانەی ئەشعەریەتە و باوەڕی زۆرینەی موسڵمانانیشە لەو کاتدا، سەعدی لەو کەش و دۆخە مەعریفی و عیرفانی و مەکتەبی ئەشعەریەتدا پەروەردە و کامڵ دەبێ تا دەرەجەی ئوستادی لە هەمان شوێن دەبڕێ و دواجار دەبێتە یەك لە ئوستادانی دەور و دەرسی هەمان دانیشگا. سەعدی تەواوی زانستەکان دەبڕێ، لە فیقهو تەفسیر و عیلمی ئەخلاق و.. تەواوی زانستەکان دەچنێ، دواجار وەکو مامۆستایەکی ئەخلاقی و پەروەردە وەکو ڕۆشنفکرێکی گەورە تەواوی دەردە کۆمەلایەتی و سیاسی و



ئەخلاقیەکان لە دو تـوێی گوڵستان و بۆستان بـە شیرینترین زمـان کـە هـەموو کـەس تێـی بگـات وەکـو چارەسـەر و دەرس و پـەروەردە و بونیادنانی کەسایەتی مەزنی ئەخلاقی پێشکەشی کۆمەڵگای دەکات.

سەعدی دوای گەڕانەوە لە گەشتە دوور و درێـژ و پـڕ ئەزمونەکەی لـە شیراز بـوو بـە سـەعدی، وە بـەڵام سـەعدی چـۆن چـۆنی بـوو بـە ئـەو سەعدیە جاویدانیە؟

سـەعدی وێـڕای ئـەوەی مامۆسـتای ئـەخلاق و واعیـزە، لەسـەروی هەموویانەوە عاشقیشە، ڕەنگە هیچ کەس بـەو چەشنە ئاگایی و ڕەوانـی و شـیرینی و ناسـکیە ئەوەنـدەی سـەعدی تـەوزیفی عیشـقی زەوینـی نەکردبێ و لەسەری نەوەستابێ.

**ئەزمونی خۆم دەگەڵ سەعدیدا**

لە ڕاستیدا کاتێ لە باخی سەعدی و دیوان و غـەزەلیاتی دەخوێنمـەوە هەسـتدەکەم لـە سـەر زەوینێکـی نـەرمم، بـن پـێم و دەور و بـەرم هـەمووی گوڵ و گوڵزار و پێدەشتێکی شین و مێرگێکی تـڕ و فێنکـە، هەسـتدەکەم لـە باخچـەی گـوڵانی پیاسـە دەکـەم، ڕوو بـەڕووی گـوڵان دانیشـتووم هـیچ دڕك و داڵێـك پێیـەکانم ئـازار نـادا، هـیچ چـقڵیەك تێمهەڵناچـەقی، بـۆنی عـەتری ئـەو گوڵسـتانە ئینسـان مەسـت دەکـات، سەعدی بە وشە تەڕ و شیرینەکانی مەستت دەکات. ئـەو لەتافەتـەی کـە لـە بـەیان و ئـەو ڕەوانیـەی بـەکاری دێنـێ، بـۆنی عـەتری لـە هـەموو لایەکی وتە و وشەکانی دێ، ئەو شیرنیەی دەیبەخشێ وەکو ئـاوی ڕەوان زەمزەمـەی ئاشقانە دەکات. لەڕاسـتیدا ئـەوە ئـەزمونی واقعیـی خۆمـە دەگـەڵ سـەعدیدا، هـەموو کـات بـۆنی خـۆش و شـیرینم دێتـە بـەر دڵ،



شنەیەکی فێنك و خۆشی لەبەر هەڵدەمزم، گیان دەبوژێنێتەوە، دڵ دەبزوێنێ، چاوان دەگەشێنێ، بە چەشنێ هەتا فێرت دەکات چۆن چۆنی وشە و قسەی دڵت بە جوانی و شیرینی و ڕەوانی دربڕیت و هەستت لە جوانترین قالبی وشەدا دابڕێژی، واتا لێرەشدا مامۆستایە.

گر دست دهد هزار جانم

در پای مبارکت فشانم

آخر به سرم گذر کن ای دوست

انگار که خاك آستانم

گر نام تو بر سرم بگویند

فریاد بر آیاد از روانم

من مهره مهر تو نریزم

الا که بریزد استخوانم

من ترك وصال تو نگویم

الا به فراق جسم و جانم

هرکس به زمان خویشتن بود

من سعدی آخر الزمانم

ئەگەر دەست بدا و هەمبێ هەزار گیانم

لە بن پێی موبارەکتدا دەیبەخشم گیانم

ئاخر ئەی دۆست بەلای ئێمەدا بگوزەرە

ئەوێستا کە هەر خاکی بەر دەرگاتم



ئەگـەر بگـوترێ نـــاوی تـۆ لەلام
هـــاوار هەڵدەستێ لـــــە گیـــانـم
دەست لـــــە میهری تـــۆ بەرنـادەم
مەگەر ئـــەو کـــاتە بڕزێ ئێسکەکانم
هەرگیز تـــەرکی ویساڵی تـــۆ ناڵێم
مەگین بـە فیراقی جیسم و گیـــانم
هەر کەس بۆ زەمـــــانی خۆیەتی
ئـــەمن سەعدی ئـــــاخیر زەمانـم

**عیشق..**

ئینسان دەگەیەنیتـە ئـەوجی لـەتیفی و نـەرمی و ناسـکی و میهرەبـانی، بـەرزە مـرۆڤ، ڕۆحێکـی بـالآ و شـیرین لەبـەر دلآن، عیشـقی واقعـی و حەقیقی ئینسان خاوێندەکاتەوە، بەلآم عیشقی شـکڵی و سـوڕەتی تـەنێ سـورەتە و بـێ سـیرەتە.. ئـەوین بروسـکەیەکی ئیلاهیـە مـرۆڤ دەگەیەنیتـە تـاقی ئاسمـان و فریشـتەگی، هـەوێنی هەسـت و هەناسـە و هەبوونی ئینسانە..

گفتم آهـــــن دلی کنم چندی
ندهم دل بـــــه هیچ دلبندی
سعدیا دور نیــــک نـامی رفت
نوبت عــاشقیش یـــک چنـدی

وتم دڵ ڕەقـــــی بنوێنم کەمێ
دڵ نەدەم بـــــە هیچ دڵبەندێ
سەعدیا دەوری ناو چاکی ڕۆیی
نـــۆرەی عـــــاشقیە کــەمێ

## گوزەرێك بە نێو باخی غەزەلیاتی شیرازیدا

بەر لەوەی بڕێ لە غەزەلیاتی سەعدیتان بۆ بخوێنمەوە و دەمتان شیرین بکەم، وەك پێشەکیەك دەمەوێ ئاماژە بە خاڵێك بکەم، ئایە هیچ یەك لە ئێوە لە خۆتان پرسیوە ئاخۆ بۆچی شاعیران ئەوەندە لە بابی عیشق دواون، لەو گەردونەدا شتێکی تر نەبووە باسی بکەن، بابەتەکانی تری ژیان چی، خۆ ئادەمی هەزار شتی لە ژیاندا هەیە.. ئەو هەموو قسە کردنە لە عیشق چیە، تەنانەت بە قەولی حافیز باسکردنی عیشق بێ پایانە چ جای خودی عیشق، هەرچی دەگوترێ لەو بارەوە دوبارە نیە:

یك قصە بیش نیست غـــــم عشق واین عجب
کز هرکس کــــە می شنوم نـــــا مکـــرر است

خەمی عەشق لـــــــە چیرۆکێکی زیاتر نیە
سەیرە! کە لە هەر کەسێ دەیبیستم دوبارە نیە

وەبەڵام ئایە عیشق چۆن چۆنی توانیویەتی سەنتەر بگرێ و ببێتە چەقی باس و خواس؟



ئایە سەبەبی دینی هەیە، دەروونی، کۆمەڵایەتی، ئەخلاقی، چی وایە کردووە و ئەو ڕۆڵەی پێداوە؟

لە ڕاستیدا ڕوانین لەو فەهەنگ و کەلەپوری لە پێشینانمان بۆمان جێماوەئەگەر ورد بینەوە دەتوانین بەشەکانی عیشق لەیەك جودا بکەینەوە، لەوەشدا داوەریەکی باش دەکەین..

ئەگەر بڕوانینە میراتی مەولانا دەبینین کە هەمووی عیشقی ئیلاهیە، عیشقی موتەعالی و ئاسمانیە، خۆ ئەگەر کەسێك عیشقی زەوینی و ئینسانیشی ببێ وردە وردە دەیگەیەنێتە کەهکەشانی ئاسمان و پلیکانەیەکە بۆ بالاّ چوون.

خوب، کاتێ دەڕوانینە عیشقی حافیز دەبینین تێکەڵەیەکە لە زەوینی ئاسمانی، ئینسانی و ئیلاهی، زۆر جاریش ئاسان نیە جوداکردنەوەی..

بەلاّم کە بەجەنابی سەعدی دەگەین تەقریبەن دەتوانین بێ دوو دڵی بڵێین کە عیشقی زەمینی و ئینسانیە لەوەشدا هیچ شەرمێك نیە.. حەقیقەتنە عیشقی ئینسانی سەعدی بابەتی گرینگ و ئەساسیە، تەواوی بابەتەکانی عیشقی نێو غەزەلیاتەکانی لە خۆشەویستی و دۆستیەوە سەرچاوە دەگرێ..

**عیشق: دڵ و زمان دەکاتەوە**

شاعیرانمان کاتێ بە عیشق دەگەن تازە نوتقیان دەبێتەوە، بە تەعبیری حافیز:

مرا تا عشق تعلیم سخن کرد

حدیثم نکتەی هر محفلی بود

**لەو کاتەوەی کە عیشق منـی فێرە قسـە کـردووە**
**قسەکانم بوونەتە کاکڵەی بە پێزی هەر مەجلیسێ**

**بلبل از فیض گــل آمــوخت سخن ورنە نبود**
**ایـن همــە قـول و غـزل در منقــارش**

**بولبول لـە فـەیـزی گوڵێڕا فێـرە قسـە بـووە**
**وەرنا ئەو هەموو قەول و غەزەلە لە دنوکیدا نەبووە**

**هەرکات دەگاتە عیشق، زمانی وەگۆ دێ، چون عیشق زمان دەکاتـەوە، دڵ دەکاتەوە، ئەندێشە و خەیاڵ دەکرێتەوە..**

**مـەولاناش بـە ئێمـە دەڵێ: عاشـقی بـوو ئێمـەی عابیـدێکی سـەنگین و ڕەنگین بووم، خواناس و گۆشەنشین، سجدەی زۆرم دەبـرد، نوێـژی زۆر و ڕۆژوی زۆرم دەگـرتن، وەرزشـی ڕۆحـی زۆر.. بـەڵام بـەو ئەندازەیـە قسـەم نـەبوو، زمـانم نەدەگـەڕا، وەلـێ ئەوکاتـەی عیشـق هـات زمـانم کرایەوە، وشە و وتە و پەیڤی فێر کردم..**

**عیشق مامۆستایە، دەرسی ئینسان دەدا، کە هیـچ مامۆسـتایەك نـاتوانێ ئەو چەشنە دەرسەت فێر بکات، هـەرکات عاشـق بـووی قسـە و خـەیاڵت بۆدێ، مرۆڤ پڕ قسـە دەبـێ، بـە چەشـنێ خۆشـت نازانیـت چۆن چۆنی ئەو دەرگا خەیاڵ و ئەندێشە و ئاڵا و واڵایە دەکرێتەوە و گیان وەهـا بـە ڕووی هاتنـدا دەکرێتەوە، دڵ دەبێتە ئەو کانیاوە زوڵاڵە نـاوی ژیـانی لـێ هەڵدەقولێ، شیرینی و هەنگی شادی و دڵاوێز..**



شاعیرانی ئێمە شاعیرانی ئەسیل، بەهۆی عیشقەوە بوونەتە شاعیر، نەك لەبەر ئەوەی شاعیر بوون ڕۆیشتبن چەمکێکیان هێنابێ بە ناوی عیشق و هەڵیان بژاردبێ و کەشفیان کردبێ و کردبیانەتە زینەت بەخشی شێعرەکانیان، نا، ئەسڵەن بەو شێوە نییە، ئەو تەسەورە کامیلەن دوورە لە حەقیقەت، بەڵکە ئەوە عاشقییە شاعیری دروست کردووە و دەرسی شێعری داداوە و فێر کردووە. لەوبارەوە جەنابی سەعدی ئەوە بە جوانی ڕوون دەکاتەوە لەو کاتەی ڕووی لە مەعشوقەکەیەتی:

معلمت همه شوخی و دلبری آموخت
جفا و ناز و عتاب و ستمگری آموخت
همه قبیله ای من عالمان دین بودن
مرا معلم عشق تو شاعر آموخت

من کە وەدوا قەبیلەی خۆم کەوتبام دەبوومە زانای دینی، بەڵام مامۆستایەکی ترم هەبوو کە عیشقە و ئەو منی کردە شاعیر.

خوب، ئەو عیشقە چیە ئەوەندەی قسەیان لێکردووە، بە چەشنێ هێندە باسی خودا و پێغەمبەر و دین نەگوتراوە، لە کاتێکدا شاعیران زانای ئاینیش بوون، ئاخۆ هەر لەبەر ئەوەی عیشق شیرینە، بەڵێ بێگومان کە شیرینە، بەڵام خۆ شتی تریش هەیە لە زانست و ئەزموونەکان کە شیرینی هەیە، بەڵام شێعر و شاعیری حەجمێکی گەورە و فراوانی لە عیشقدا جێ گرتووە، ئەو جوانیەی کە عیشق بە



وشەی بەخشیوە ناتوانین ئەسڵەن تەرجەمە بکرێ بۆ زمانێکی تر، چونکە تەنێ وشە نیە، ئەزمون و زەوق و چێژیشی دەناودایە.

وەبەلام نهێنی گرینگی ئەوەی کە ئەوەندە شاعیرانی ئێمە لە عیشق دووان و بەردەوام دوپات دەبێتەوە، لەبەر ئەوەیە چونکە خۆشەویستی هەناوی ئادەمییە، دەکرێ ئینسان زانستەکانی نەبێ و ئادەمیشە، بەلام ئینسان کە خۆشەویستیی نەبێ و نەتوانێ خۆشەویستی ببێ و گیانی خۆشەویستی لە هەناودا نەڕوابێ، بێگومان بەشێکی گرینگی ئادەمیەتی نوقسانە، موحیبەت پێداویستی ئینسانە و بەشێك لە گیان و ئینسان بوون.. خۆشەویستی خەلوزێکی داگیرساوە هەرگیز دانامرکێتەوە، هەمیشە گەشە، هەرکات گەشتر بێ ئینسان بوون بالاترە.

سەعدی و شاعیرانمان هەمیشە ئەوەمان دێننەوە یاد کە فەزیلەتی خۆشەویستیمان لەبەر چاوان بێ و تەرکی موحیبەت نەکەین، چون ئەگەر ئینسان خۆشەویستی بۆ دەرەوە نەبێ و ئەوانیتریش خۆشیان نەوێ، کەلێنێکی گەورەی ئادەمی تێدا دروست دەبێ، هەمیشە پێمان دەڵێ ئەگەر لە ژیاندا پشك و بەشن لە خۆشەویستیدا نەبێ لە تواوی ژیان بێ بەش بووین، لە مەرتەبەی ئادەمی بوون هاتوینە خوارێ.

ئەگەر لە خۆشەویستیدا بەمەبەسی سود و قازانجی خۆم و لەبەر خاتری نەفسی خۆم تۆم بوێ و خۆشەویستی ئەوی ترم بوێ، ئەوە خۆشەویستی نیە، خۆ خۆشەویستییە، بەلام ئەگەر خۆشەویستیەکە لەبەر خۆشەویستی خۆی بوو، دەکرێ بڵێین سەرەتای لەدایك بوونی عیشقێکی خالیس و پاکیزەیە.



خۆشەویستیش چەندین پلەی هەیە، ئەکاتەی کە دەگاتە لوتکە و ئەوجی تاو تین ئنجا دەچێتە ناو مانا و کرۆکی عیشق. خۆشەویستی فەزیلەتێکی ئەخلاقی بالآیە، مرۆڤ ناسك و بۆنخۆش دەکات، میهر و شەفەقەت بە گیانی مرۆڤ دەبەخشێ، مرۆڤ لە خود سەنتەری دەرباز دەکات، کەسێکی تر دێتە ناو گیان و ژیانەوە، کە ئەوەش ڕوکنێکی گرینگی ئەخلاقییە، چونکە ئینسان نابێ تەنێ هەر لەبیری خۆیدابێ، عیشق لە تەنیا خۆ بینین دەتباتە دەرێ، دەتگەیەنیتە مەرتەبەی ئیحسان و لەخۆ بوردن و حەقی خۆت گوزەران، ئەوەش دیسان ڕوکنی بنەڕەتی ئەخلاقە. عیشق کۆمەڵە فەزیلەتێك دەبەخشێ هیچ شتێکی تر توانای ئەو چەشنە بەخشینەی نیە. عیشق هونەرە و ئەزمونکردنە، تا بەرە بەرە دەگەیتە کەماڵ، بەردەوام پێویستی بە شەور و شەوقە تاوکو شکۆفە دەکات.

### سەعدی شیرین غەزەل

وەکو کۆتایی قسە لەمەڕ سەعدی شیرین پەیڤدا کۆشە گوڵێك لە گوڵستانی شیرین غەزەلی سەعدی دەخوێنینەوە تا دەممان شیرین بێ و نەسیمێکی سازگار بداتە دڵ و گیان، وەك نوقڵ و نەباتێك بۆ ئاشقانی بەیەك گەیشتوو و مستە خوێنیەکیش بۆ زامی برینی هەڵبڕاواندا.. سەعدی هەم لە ویساڵ و هەم فیراق و هەڵبڕانی ئاشقان دەدوێ.

بۆ حاڵی فیراق بەو چەشنە کوڵی خۆ هەڵدەڕێژێ:

**فیراق:**

**دوش بی روی تـو آتش بەسـرم بر می شـد**

**و آبی از دیده می آید کـه زمین تر می شـد**

**تا به افسوس به پایـــان نرود عمر عــزیز**

**همه شب ذکر تو مــی رفت و مکرر مــی شد**

**از خیال تو هر ســــو که نظر می کـردم**

**پیش چشمم در و دیــــوار مصور مــی شد**

**گاه چون عود بر آتش دل تنگم می سوخت**

**گـــاه چـــون مجمــــــره ام دود مــی شـد**

**دوێ شەو بێ ڕووی تۆ ئاگرێ لە سەر سەرمەوە هەڵدەسا**

**زەوینی تەڕ دەکرد بــەو ئــاوەی لــە چاوانــم دەچۆڕا**

**تا بە ئــەفســوس عــومــری عــەزیز بــە کـۆتا نــەڕوا**

**هەموو شـــەوێ چەنــد بـارە یـادی نــاوی تـۆ دەکـرا**

**بە خەیـــــاڵی تـــۆوە ڕووم دەکـــردە هـــەر جێیـەك**

**لە پێش چـاوانـــم دەر و دیــــوار وێنــەی تـۆی دەدا**

**گـاهــێ وەکـــو عــــــود دڵــی تەنـگـم دەسـوتا**

**گاهێ وەکو گوناحبـار دەبــوومـە دوکەڵ بــە هەوادا**

*****

**بۆ ویساڵیش بەم شێوەیە شای و شاگەشکەی خۆی نیشان دەدا:**

**ویساڵ:**



یك امشبی كه در آغوش شـــاهد شكـــرم

گرم چو عود بر آتش نهند غـــم نخورم

ببند یك نفس ای آسمـــــان دریچه صبح

بر آفتاب كه امشب خوشســـــت بـا قمرم

ندانم این شب قدرست یـــــا ستاره روز

توی برابـــر مـــــن یـــا خیال در نـظـــرم

خوشا هوای گلستـــــان و خـواب بوستـان

اگـــــر نبودی تشـــــویش بلبل سحـــرم

*********

ئەو شەو لــە ئامێزی یـــاری شـــەكـــرین دام

خەمم نیە، گەرم وەكو عود لـــەسەر ئاگـــرم

ئاسمان هەناسەیەك دەرچـــــەی سپێدە ڕاگــرە

خۆر، چون ئەوشەوم زۆر خۆشە لەگەڵ مانگم

نازانم ئەو شەو شەوی قەدرە یا ستـارەی ڕۆژە

ئەتۆی بەرانبەری منی یا خەیـاڵە دە نەزەرم

خۆشە هــەوای گوڵستـــان و خەوی بۆستانێ

گەر پەشۆكــوی نەبێ وەك بولبولی سەحەرم

سەعدی پاك و پاكیزە دەدوێ كە هیچ شاعیرێكی تـری وەكو مـەولانا و حافیز نیانە.

نە طریق دوستانسـت و نـە شـــرط مهربانی

كە بە دوستان یـك دل ســر دسـت بر فشانی

نفسی بیـــا و بنشین سخنــی بگــو و بشنو

که به تشنگی بـــــــــر آب زنــدگـانی

غم دل به کس نگویم که بگفت رنــگ رویم

تو به صورتم نگه کن کــــه سرایرم بـدانی

نه خلاف عهد کردم که حدیث جز تو گفتم

همه بر سر زبانند و تـــــو در میان جـانی

نه عجب کمال حسنت که به صد زبان بگویم

که هنوز پیش ذکـــــرت خجلم ز بی زبانی

دل دردمند سعـــــدی ز محبت تو خون شد

نه به وصل می رسانی نه به قتل می رهانی

نه ڕێ و شوێنی دۆستانە و نە شـــەرتی میهرەبانی

کە لەگەڵ دۆستانی یەکدڵ بیکەی تورەی و عەسەبانی

تاوێ وەرە و دانیشە و قســـەیەك بـــکە و ببیستە

بەخوا فــــرە تینووم بۆ نـــاوی زیندەگــــــــانی

خەمی دڵ بەکەس ناڵێم ڕەنـــــــــگی ڕووم دەیڵێ

ئەتۆ بڕوانە ڕوخسارم هەمـــوو ڕازەکــــــانی دەزانی

خیلافی پەیمانم نەکردووە کـــە جگە لە تۆم وتووە

هەمووان لەسەری زمانن و ئەتۆ لە نـــاو قەدی گیانی

عەجەب نیە کەماڵی حوسنت بە ســـــەد زوان بڵێم

کە تا وێستاش لە باسی تۆدا خەجلاوم لە بێ زوبانی

دڵی دەرد مەندی سعدی لەموحیبەتی تۆ بۆتە خوێن

نە بە کوشتنی دەدەی و نـــە بە وەسڵی دەگـــەیەنی



**سەعدی کاتێ قسە لە عیشقی پاك و زولاڵ دەکات کەسی عاشقی ڕاست و حەقیقی لە خۆشەویستی مەحبوب حەزناکات بڕوانێتە ڕوخساری یانیش بگا بە وەسڵی هەروەك دەبێژێ:**

**ز محبتت نخواهم کـــــــه نظر کنم به رویت**

**که محب صـــادق آنســـت که پـــاك بـاز باشد**

**واتا: لە خۆشەویستیدا نـــــــــامەوێ بڕوانمە ڕووت، موحیبی ڕاست ئــــەوە کە پاکبازبێ، واتا تـەنێ بەشداری بکات لـە قوماری عیشق و خۆشەویستیدا دۆستدا.**

**چنانت دوست می دارم که وصلم دل نمی خواهد**

**کمال دوستی باشد مــــــراد از دوست نگرفتن**

**واتا: وەها خۆشم دەوێی کـە دڵم وەسڵی ناوێ، کەماڵی دۆسـتی ئـەوە کە ئەوەی دەتهەوێ لە دۆستی داوا نەکەیت و نەخوازی.**

**غەزەلێك بۆ حەزرەتی ڕەسولّ " درودی خوای لێ بێ"**

**تو آن نه ای کـه دل از صحبت بر گیرند**

**و گر ملول شـوی صـــاحبی دگر گیرند**

**و گر به خشـم برانی طریق رفتن نیست**

**کجا روند کـــه یـــار از تو خوبتر گیرنـد**

**قمر مقابله بــــــا روی او نیـارد کرد**

و گر کند همه کس عیب بر قمر گیرند

به چند ســــال نشـاید گرفت ملکی را

که خسروان ملاحت به یك نظر گیرند

وصال کعبه میســـــر نمی شود سعدی

مگـر که راه بیــابـــان پر خطر گیرند

**********

تۆ ئەو کەسە نیت کە دڵ لـە هاودڵیت بەر بدرێ

وەگەر مەلول بوویت و یـــارێکی تـــر بگیـردرێ

ئەگەر بە تورەیش وەدەربنێی، ڕێی ڕۆیشتنێ نیە

بۆ کوێ بڕۆن تا یارێکی باشتر لە تۆ پەیدا بکرێ

جوانی مانگێ بەرانبـــــــــەری ڕووی تـۆ ناکرێ

خۆ گەر کرا لای هەمــووان تانە لە مانگێ دەگرێ

بە چــەن ساڵــێ دەوڵـــــەتێــــك نــــاگیـــرێ

بەڵام خوسرەوانی لەتیف بە یەك نەزەر دەیگرێ

ویساڵی کابـەتــولا مەیســـەر نـــــابێ سەعـدی

مەگین ڕێی بیابانی پــڕ خەتـەر بگرێتە بـــەرێ

غەزەلی سەعدی چەشنی ئاسکی پەرەی گوڵ، زوڵاڵی ئـاوی ڕەوانـی کانی، جوانیی ئاسمانی پڕ ئەستێرەیە. سـەعدی غـەزەلیاتی بـە ئـەوجی خـۆی گەیانـد، تـەواوی شـاعیران و تـا حـافیز، سـەعدی بـە ئوسـتادی غەزەل دادەنێن.



ئـەهلی ئـەدەب، دەسـتپێکی غـەزەل بـۆ چـەرخی شەشـی کۆچـی دەگێڕنـەوە، واتـا سـەدەیەك پـێش هـاتنی سـەعدی، شـاعیرانی وەکـو ئەنوەری و سەنائی و.. قەسیدە سەرا بوون، غەزەلی سەربەخۆی خۆیـان هەبوو، بەلاّم لـە بـەرەك ڕۆنانیـان بـە غـەزەلی سـەعدی، ئـەوان لێکچوو نزیکایەتیان دەگەڵ غەزەلی پێش خۆیان هەیـە تـا غـەزەلی سـەعدی. بـە هاتنی سەعدی وەرچەرخانێکی گـەورە لـە غەزەلـدا ڕوو دەدا، نـە تـەنێ غـەزەلیاتی سـەعدی دەبێتـە ئـەو قاڵبـەی لـە ژێـر کاریگـەری نـاوو پـەیڕەوی وی لـە شـیرین ڕاوێژیـدا دەگیردرێتـە بـەر، بـەڵکو بۆسـتان و گوڵستانی بـێ هاوتاشـی شـوێنەواری گـەورەی بەسـەر کۆمـەڵگای فارسـی زوباندا بووەو هەیە، کە لە غەزەلیاتەکەی کەمتری لێی ناڕوانرێ.

غەزەلیاتی سـەعدی پێدەشـت و مێرگێکـە تـا چاو بـڕ دەکا سـەوزایی و شـیناییە، خوێندنـەوەی دیـوانی غـەزەلیاتی سـەعدی دلگەشـێن و ڕۆح پەروەرە.

این بوی روح پرور از آن خـوی دلبـر اسـت
وین آب زندگانی از آن حـــوض کوثر است
ای بـاد بوستـان مگـرت نـــافه در میان؟
وی مرغ آشنـا مگــــرت نامه در پر اسـت؟
بوی بهشت می گـــذرد یـا نسیم دوســت؟
یا کـــاروان صبح کـه گیتی منور اســـت
این قاصد از کدام زمیـن اسـت مشك بوی؟
وین نامه در چه داشت که عنوان معطر است

بر راه بــــاد عــود بر آتش نهـــاده اند

یا خود در آن زمین که تویی خاك عنبرست

بازآ که در فــــــراق تــو چشم امیــــدوار

چون گوش رزەدار بــــر الله اکبــــــر است

بازآ که در فـــــراق تــو چشم امیـــدوار

چون گــــــوش رزەدار بــــر الله اکبر است

دانی که چــون هـــمی گـــذرانیم روزگــار

روزی که بی ــــو می گــذرد محشــر اســت

گفتیــم عشــق را بـــــه صبوری دوا کنیم

هر روز عشـــق بیشتــر و صــبر کمتر است

همچون درخت بـادیـه سعدی به برق شــوق

سوزان و میــوه سخـنش همچنـان تـر اسـت

**************

ئەو بۆنە ڕۆح پەرومرە لــەو باسـکی لای دڵبـــەرە

ئـــــەو ئـــــاوی ژیـانــە لــەو کـانیی کــەوسەرە

هەی شنــەی بۆستان ئـــــەوە بۆنی عەتـرت پێیە

وەی باڵندەی ئاشنا مەگەر نامەت لەبن پەڕو باڵدایە

بـۆنـی بــەهەشتــە دێ یــا نــەسیمـی دۆســتە

یـــا کــاروانی بــــەیــانە دنیــا وا مونـــەومرە



ئەو پەیکی نامە لە کام زەوینە هێندە میسك بۆنە
ئەو نـــامە بـــاسی چیە، نـــاوی ئـاوا بۆنـدارە

لە ڕێ، بەرەو بـا، عـود و عەنبـەریان دەسوتـاند
یــــا ئەو زەویــەی تــۆی لێی خــاك عەنبـەرە

دە وەرە، لـە دووری تـــــۆ چاوی چاو لـە ڕێ
وەکو گوێ قولاغی ڕۆژوگــر بۆ الله ئـــەکبـەرە

دەزانـی چۆنـم ڕۆژگـــــــار تێپـەڕانـــدووە
هەر ڕۆژەی بـێ تــۆ دەڕوا وەکـــو مەحشـەرە

گوتـم عیشقم بــــە سەبـــر دەوا بـــــکەم
لـــێ هەمـــوو ڕۆژێ عیشق پترو سەبرم کەمترە

وەکو درەختی دۆڵ سەعدی بە پەلکە گەڵی شەوق
دەسوتێ و میوەی قســـانیشی هەر تــــەڕە

**************

غـەزەلی فارسـی بـۆ دوو دەسـتە دابـەش دەکـرێ، عاشـقانەو عاریفانــە، بەگشتی غـەزەلی سـەعدی بـە نمونـەی بـالآی غـەزەلیاتی ئاشقانە بـاس دەکـرێ و غــەزەلیاتی شەمسـی مـەولانا جـەلادینیش وەك غــەزەلیاتی

عیرفانی نێودێر دەکەن. بەڵام لە ڕاستیدا غەزەلی سەعدی ناتوانرێ وەك عیشقی مەجازی ناو ببرێ. سەعدی بەرگی عیرفانی دەبەر غەزەلەکانی خۆی کردووە، یانیش زۆربەی غەزەلە عاشقانەکانی دەکرێ تەئویلی عیرفانیان بۆ بکرێ.

وەسفی عیشق و مەعشوق لە غەزەلی سەعدیدا، وەسفی بالآترین عیشق و موحیبەتێکە کە دەکرێ ئینسان پێیەوە موبتەلا بێ. سەعدی پێچەوانەی هێندێ شاعیران کە بۆ مەعشوقی خەیاڵی غەزەلیان خوێندووە، ئەو لە خۆشەویست و مەعشوق دەدوێ، ئەو باسی عاشقێکی دڵسوتاو و هیجران کێش دەکات، لە هەمان حاڵدا وەسفی سەعدی بۆ مەعشوق لە واقیعدا وەسفی عیشق و موحیبەتە، کە پێویستە هەبێ لە گیان و دڵی هەر ئینسانێکدا کە گڵی وی بە عیشق شێلراوە، عیشقێك کە هۆی سەرەکی دروستکردنی مرۆڤە.

عیشق لە وجودی سەعدیدا بە کەماڵێك گەیشتووە کە لە جیهاندا بێجگە لە مەعشوق بە هیچ شتێکی دی نافکرێ و داخوازی تری نیە. هەروەکو دەڵێ ئەمن حەسودی بە هیچ کەسەوە نابەم، مەگەر بە ئەو کەسەی کە بە ویسالی مەعشوقی خۆی گەیشتووە.

هرگز حسد نبردم بر منصبی و مالی
الا بر آنکه دارد با دلبری وصالی

قەت حەسودیم بە پایەو ماڵ نەبردووە
مەگین بەو کەسەی بە دڵبەری گەیشتووە





## عیشق و دڵداری لە غەزەلی سەعدیدا

تەواوی توێژەران کە دەربارەی غەزەل و جۆرەکانی قسەیان کردووە، بە پێی تامی غەزەلیاتی نێو دیوانی هەر شاعیرێك، شێعرو شاعیریان کردۆتە دوو دەستە، عاشقانەو عاریفانە، هەر بەو هۆیە غەزەلی سەعدی و بڕێ شاعیرانی شوێنکەوتەی وی بە ئاشقانەو غەزەلیاتی مەولەوی و شاعیرانی وەکو عێراقی، لە دەستەی عیرفانی و عاریفانەیان هەژمار کردووە، بێجگە لە حافیز کە تایبەتمەندی خۆی هەیەو لە قالبی غەزەلدا دانەنراوە " غەزەلی حافیزانە "ی نێو نراوە.
بەڵام خاڵێکی تر کەمتر سەرنج دراوە، سەعدی کە ئوستادی بێ هاوتای غەزەلی فارسیە، بێ ئەوەی عیشق و دڵبەندیەکەی بۆ ئاشقانەو عاریفانە دابەش بکرێ، بۆخۆی تەوەری نێوەرۆکی شێعری خۆی بەیانکردووە. غەزەلی سەعدی زمانی عیشق و موحیببەتە، گۆیاترین زمانی عیشقە، بۆ مەعشوقێکی تایبەتی نەهۆنراون، تا مەوجودێکی ئاسمانی یا زەمینی تێدا ببینم و بزانم.

سەعدی لە غەزەلەکانی خۆیدا هەوڵدەدا موحیببەت و عیشق بگەیەنێتە کەماڵ و دە شێعرەکانیدا تەجلا بکا، چونکە تا کەماڵی عیشق نەناسرێ، عاشق و سالیك بە کەماڵ و وەسڵ ناگات.



لە ڕوانگەی سەعدی ڕۆژان و دەورانی عیشق باشترین دەورانە، ڕۆژی عاشق نابێتە شەو. عیشق سەرەتاو کۆتایی نیە، تا کەسێ زمانی عیشق نەزانێ بە ڕەمزو ڕازی عیشق ئاشنا نابێ. ئەو تەرزە عاشقیە لەو چەند غەزەلەدا دەبینم:

خوشتر از دوران عشق ایـــام نیست

بامداد عاشقان را شـــــــام نیست

مگربان رفتنـــد و صوفی در سماع

عشق را آغـــاز هست پـیان نیست

تا نسوزد بر نیـــــــاید بوی عود

پخته داند کاین سخن با خام نیست

هرکسی را نام معشوقی کـــه هست

می برد معشوق ما را نـــام نیست

مستی از من پرس و شور عاشقی

و آن کجا داند که درد آشام نیست

باد صبح و خاك شیـــراز آتشیست

هر که را در وی گرفت آرام نیست

سعدیا چون بت شکستی خود مباش

خود پرستی کمتر از اصنام نیست



خۆشتر لە دەورانــی عیشق ڕۆژێکی دی نیە
بــەیـــانیـی ئـــاشقـــــان ئێوارەی نیە

دەهۆڵ کوت ڕۆیشتن و سۆفی لە سەمــادان
عیشق دەستپێکی هەیـە، خۆ پـایـانی نـیـە

تـــا نــەسوتــێ بۆنی عــود بڵێند نـابێ
کامڵ دەزانێ ئەو قسەیەم دەگەڵ ساوا نیە

هـەرکەسـە نـاوی مــەعشـوقی خۆی دەبا
خـــۆ مەعشــــوقی مــــە نــاوی نیە

مەستی و شەیدایی عیشـــق لە من بپرسە
ئـــــەو کــوا دەزانــێ تـــامی پیاڵە چیە

شنـەی بەیـــان و خـــاکی شیـرازێ ئاگـــرە
بەر هـــەر کــێ کـــەوێ ئـــــارامی نیە

سەعــدی وەك بــوت لـــە خۆت مەڕوانە
چوون خۆپەرستی کـەمتر لە سـەنەم نیە

ئـەو وەسـف و سـەنایەی کـە سـەعدی بـۆ عیشـقی دەکـات، لـە دڵدا ڕۆ دەنیشێ، ئەوەی کە عاشقان وعاریفـان پێیانوایـە عیشق وەسـف نـاکرێ گوتنی نیەو چێژە، سـەعدی بـە زمـانی غـەزەلی خـۆی کـە ئاشقانەترین



زمانە وتویەتی، هێناویەتە گۆ، بە چەشنێ هەرکەسەو زمانی غەزەلی سەعدی بە زمانی دڵی خۆی حیساب دەکاو هەر یەکە لە سیلە چاوو دڵی خۆیەوە بوەتە یاری شێعری سەعدی، مرۆی عاریف عاریفانەی ئەو دەناسێ و هەڵداوێری، ئاشقانیش ئاشقانەکەی دەزانێ ڕازی دڵی خۆی لە زمانی سەعدیەوە دەبیستێ، شێعرو وتەو هەستی سەعدی دوندی شەیدایی و عیشقە.





## مۆسیقا و غەزەلیاتی سەعدی[٣٧]

**ئوستاد محمد ڕەزا شەجەریان**

چە خوش باشد آواز نرم حزین
به گوش حریفان مست صبوح
به از روی خوب است آواز خوش
که آن حظ نفس است و این قوت روح

چەندە خۆشە ئاوازی نەرمی حەزین
لە گوێی هەمپیالآنی مەستی بەیان
ئاوازی خۆش جوانترە لە ڕوخساری جوان
ئەو بەشی نەفسە، ئەمیان قوتی گیان

هەیوان و دەر و گونبەد و حەوشە و باخ و گوڵستانی هەمیشە بۆستانی دلآوێزی مەزاری سەعدی لە شیرازێ یەکپارچە ڕۆحانیەتە، پڕە لە ئاواز و سەدا و نەغمەی عیشق و مەستی، سەعدی گیان دێنێتە جۆش، دڵ دەستێنێ، دیمەنی مەزاری دڵنشینی چاوان دەگەشێنێ..

---

[٣٧] . پوختەیەك لە گفتوگۆی ئوستاد شەجەریان لە مەڕ مۆسیقا لە غەزەلی سەعدیدا







کەلامی ئاهەنگینی جەنابی سەعدی جاویدانیە لە مێژووی ئەدەبیانی فارسیدا، ئێمە مۆسیقا و ئاواز زیاتر لە ناو غەزەلیاتی سەعدیدا دەتوانین بدۆزینەوە و بگەڕێین، موزیك زانان تا ئەندازەیەك توانیویانە قوتی ڕۆح لە ناو فەرهەنگ و میراتی سەعدیدا هەڵێنجن.

ئوستادی مەزن موحەممەد ڕەزا شەجەریان پێوەندییەکی پتەو و فراوانی لەگەڵ سەعدیدا هەیە و بەرهەمەکانیشی بەڵگەی ئەو قسەیەن.

لە مێزگردێکی تایبەتدا لە ژێر ناونیشانی " مۆسیقا لە غەزەلی سەعدیدا " بە حزوری شەجەریان گەورە مامۆستای ئاوازی ئێرانی، دەنگ زولاڵی ئاسمانی، لە ساڵی ١٣٨٨ هەتاوی، شەجەریان هەر لە هەوەڵی قسەکانی وتی: من هەموو تەمەنم لەگەڵ سەعدیدا گوزەراندووە و ئاوێتەی سەعدی و فەرهەنگ و ئەدەبیات و غەزەلی حەزرەتی شێخی ئەجل بووم، عەیامێکە لەناو سەعدیدا دەژیم..

هونەرمەند پێویستە جوان لەو غەزەلە بگات کە دەیەوێ بیخوێنێ و بە ئاواز بیچڕێ، هەروەك موسیقیش دەبێ بە جوانی فەهمی بکات تاوەکو بتوانێ تەواو تێکەڵی ببن و غەزەل و مۆسیقا ئاوێتەی یەکتر بن، ڕۆحێك دروست بکەن، زیندویەتی غەزەل نمایش بکرێ.

زۆرێك لە هونەرمەندانی ئێرانی لە پێش " تاج ئیسفەهانی و غولام حسێن بەنان " و هی تر غەزەلیاتی سەعدیان خوێندووە، بەلام بە هۆی نەبوونی کەرەسەتە و باش نەگەیشتنیان ناتوانین بە دروستی بڕیار بدەین.

وەلێ هونەرمەندانی ئەم دواییانە ئەوانەی هاو زەمەنی منن یا لە پێش منەوە بوون کەمتر غەزەلیاتی سەعدی و حافیزیان چرپیوە و پرژاونەتە سەر غەزەلیاتی ئەو مەزنانە، پتر بە دوای ئەو شێعرانەدا بوون کە خەڵکی زۆرتریان بیستووە و دەبیستن، هەر لە بنەڕەتەوە کەمتر ناوڕیان وە سەعدی داوەتەوە و غەزەلیاتی ئەویان کردۆتە ئاواز و مۆسیقا، مەگەر تاك بەیتی و دوو بەیتی دەرهێنرابێ و تێکەڵی ئاواز و سەدایان کردبێ، بەڵام کەسێکی وەکو تاج ئیسفەهانی زۆرێك لە غەزەلەکانی سەعدی کردۆتە ئاواز و خوێندویەتی.

## من لەگەڵ سەعدیدا ژیاوم

ژیانی من ئاوێتەی غەزەلیاتی سەعدیە و لەگەڵ ئەودا ژیاوم و دەژیم، ئنجا حافیز و عەتار و مەولانام خوێندووە.
پێویستە مۆسیقا و شێعر و ئاواز حاڵ و هەوای تێکەڵ بکرێ، بۆنمونە لەو دوو بەیتەدا:

گفتم لب تـــو را کـــه دل من تو برده ای
گفتا کدام دل، چه نشان، کی، کجا، که برد

گوتم لێوی تۆ دڵی منی بردووە
گوتی کام دڵ، کوا نیشانەی، کەی، لە کوێ، کێ بردوویە

پێویستە شێعر جوان بخوێنرێتەوە و حاڵ و هەوای ئاوێتە ببێ، من ئەگەر بە دروستی ئاواز نەڵێم، شێعریشم دروست نەخوێندۆتەوە. پێویستە ئەوەی شاعیر گوتویەتی کەشفی بکەم، پێویستە تەواوی

هەست و ناخی شاعیر لە بەیانی شێعرەکەدا بەرجەستە بکەم، هەروەك دەشکرێ حاڵ و هەواوی خۆم تێکەڵی شێعرەکە بکەم و جوانتری بکەم و چەشنێ کار بکەم کە باڵا و دڵنشین بێ. دەبێ شێعر و مۆسیقا وەها ئاوێتەی یەکتر بن ئینسان بفڕێنێ، مۆسیقا لەناو شێعردایە دەبێ دەربهێنرێ، من زیاتر حاڵ و هەوا و هەستی خۆم لە شێعردا پەیدا دەکەم و تێکەڵ دەکەم، کاتێ غەزەلێك دەخوێنمەوە و دەسترم حافیز و سەعدی نیە، ماڵی خۆمە، ئەوە منم خەریکە دەیانخوێنم و بەیانی منە.

دەکرێ غەزەل فەهەم نەکرێ، بەڵام بابەتەکە هەست پێدەکرێ، کاتێ ناوەرۆکی شێعر دەگەڵ مۆسیقا هەماهەنگ دەکەیت، بێ ئەوەی کەسێك لە شێعرەکە بگات بەڵام مۆسیقا حاڵ و هەوای شێعرەکە دەگوازێتەوە و فەهم دەکرێ. ئەوە زۆر گرینگە بە چەشنێ بەیان بکرێ کە ئەگەر کەسێك زمانی فارسیش نەزانێ فۆرمی ئاوازەکە تێبگات، هەم لە ڕوداو و مەبەستی خوێنەر چیە. لەو ماوەیەدا دەگەڵ هەرکەسێك ڕوو بەڕوو بوبمەوە خۆشبەختانە تێدەگەیشت و وێڕای شێعر و بابەتەکە دەجولا، ئەسڵەن مۆسیقا کاتێ دەتوانرێ دەوڵەمەند بێ کە بتوانێ تەفسیری ئەوە بکات..

سەعدی ڕەوانترین غەزەلی وتووە، شێعرەکانی ئەوەندە جوان و هێندە خۆش و ڕاحەت دەچڕێ کە هەموو کەس بە ئاسانی فەهمی دەکات، بەهۆی ئەوەی کە دەربڕین و تێگەیشتنیان ئاسانە و عاشقانەترینن، بۆیە زۆر هەڵبژێردراو و خوێندراون، باشتر دەخرێنە ناو ئاواز و مۆسیقا، بۆ مەولانا و حافیز هەمو ئاواز خوێنێك ناتوانێ مەلەی تێدا بکات.

ئوستاد شەجەریان لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا کە غەزەلیاتی حافیزی زۆر خوێندووە، بەڵام ئێوە چۆن توانیوتانە ئەو غەزەلە دشوارە بخوێنن:

مرا چشمیست خون افشـــان ز دست آن کمان ابرو

جهان بس فتنه خواهد دید از آن چشم و آن ابرو

شەجەریان لەوەڵامدا دەڵێ: هەڵبەتە قەبوڵمە کە سەعدی زۆر ڕاحەتە و گوتنیان وەکو گۆرانی و هێنانیان بۆ ناو ئاواز و مۆسیقا هیچ گرفتێکی نیە و چەشنی غەزەلیاتی حافیز نیە، هونەرمەند پێویستە بگەڕێ و بزانێ کامیان هەڵئەبژێرێ، هونەرمەند و موسیقیش بۆ چوونە ناو شێعر و بە ئاواز کردنی پێویستە لەسەرەتا مانای شێعر بزانن..

لە درێژەی وتوێژەکەدا ئەو پرسیارەشی ئاراستە کرا کە ئاخۆ کام غەزەلی سەعدی بۆ گوتن بەسەر ئەوانی تردا پەسند تر و خۆشتر دەبینێ؟

لە وەڵامدا گوتی: دەکرێ یەکێك لە کارەکانم بۆ من دڵنشینتر بێ، وا هەستئەکەم غەزەلی:

بگذار تا مقابل روی تـــو بگذارم

دزدیده در شمایل خـوب تو بنگریم

کە ساڵی ١٣٦١ هەتاوی پێشکەشم کردووە، بەلامەوە سەرنج ڕاکێش و خۆشتر و یەکێکە لە کارە باشەکانی ئەو ساڵە.





لە کۆتاییدا بە خوێندنی غەزەل ئاوازێکی سەعدی لەلایەن ئوستاد شەجەریان لە هەیوانی کۆشکی مەزارگەی سەعدی بە پێشوازی ئامادەبوان بە کۆتا هات و وەکو شیرینیەك پێشکەشکرا..

## پەیقی عیشق

یەکێك لەو غەزەلانەی ئوستادی سەدا ئاسمانی کردویەتی بە ئاواز:

سخن عشق تو بی آن کـه برآید به زبانم

رنگ رخساره خبر می دهـد از حـال نهانم

گاه گویـــم که بنالم ز پریشانی حالم

باز گویم که عیانت چه حـاجت به بیانم

گر چنانـــست که روزی من مسکین گدارا

به در غیر ببینی ز در خـــویش برانم

من در اندیشه آنم کـه روان بر تو فشانم

نه در اندیشه کـه خـود را کمندت برهانم

گر تو شیرین زمـانی نظـری نیز به من کن

که به دیوانگی از عشق تـو فرهادم زمانم

نه مرا طاقت غربت و نه ترا خاطر قربت

دل نهادم به صبوری کەجز این چارە ندانم

**********************

پەیقی عیشقی تۆ بێ ئەوەی بێتە دەرێ لە زمانم

ڕەنگی ڕوخسارم خەبەریّ دەدا بە حالّی گیانم
دەمیّ دەلّیم بۆ پەرێشانی حالّم بنالّم
دەمیّ دەلّیم خۆ دیارە چ پێویستە بە بەیانم
گەر ڕۆژیّ منی قەلەندەرت لە دەرێکی تر بینی
لە دەرگای خۆتم وەدەرێنیّ هەتاکو ماوم
ئەمن لە بیری ئەوەدام فیدات بکەم گیانی ڕەوانم
نەك لە بیری ئەوەدا خۆم لە داوی تۆ دەراوێم
ئەگەر تۆ شیرینی زەمانی ئاورێکم ویّدە
خۆ لە عیشقی تۆ ئەمنیش فەرهادی زەمانم
نە من هەمە تاقەتی دوری و نە تۆ مەیلی نزیکی
دلّم دایە دەستی سەبوری خۆ چارەیەکی تر نازانم

**غەزەلێکی تر بە ئاوازی شەجەریانەوە:**

ای پیک پی خجسته که داری نشان دوست
با مگو بجز سخن دل نشان دوست
حال از دهان آن دوست شنیدن چه خوش بود
یا از دهان آن که شنید از دهان دوست
ای یار آشنا علم کاروان کجاست
تا سر نهم بر قدم ساربان دوست
گر زر فدای پای دوست کنند اهل روزگار
ما سر فدای پای رسالت رسان دوست
رنجور عشق دوست چنانم که هر که دید

رحمت کند مگـــــر دل نـامهـربان دوسـت

گر دوست بنــــــــده را بکشد یا بپــرورد

تسلیــم آن بنـــده و فرمـان از آن دوســت

بی حســرت از جهـان نرود هیچ کس بـه در

الا شهید عشـق بــه تیــر از کمــان دوست

بعد از تـــو هیــچ در دل سعدی گـذر نکرد

وان کیست در جهان که بگیرد مکان دوست



هەی پەیکی پیرۆز کە پێتە هـەواڵ و شوێنی دۆسـت

دەگەڵ من مەیلێ جگە لـە قسـەی دڵ و باسی دۆست

بیستنی حاڵ لە دەمی دۆستەوە چەندە خۆش دەبوو

یا لە زاری ئەوکەسەی کە بیستویەتی لە دەمی دۆست

هـــەی یـاری ئاشنـا نـالآی کـاروان لـــە کوێیە

تاکو ســـەرم بخەمــە بــن پێی ســـەرقافڵەی دۆست

ئەگەر ئەهلی ڕۆژگـــار زێـــڕ فیدای دۆســـت دەکەن

ئەمن سەرم دەکەمە فیدای پێی نـامـە هێنەری دۆست

ئەوەندە ڕەنجبــەری عیشقی دۆستـم هـەژێ ببینێ

ڕەحمەت دەنێرێ، تـەمنێ دڵی نـامیهـرەبانی دۆسـت

ئەگەر دۆست بەنــــدە بکوژێ یـانە بیکا پـەروەردە

تەسلیم لە بەندەوە و فـەرمانیش هەر لـە دۆســت

بێ حەسرەت لە جیهــــان کـــەس نـاڕواتە دەرێ

سەعدی شیرازی

**ئیلا شەهیــدی عیشق بــە تیری کــەمانی دۆست**

**دوای تـۆ هیچ بە نـــاو دڵی سەعـدیدا گوزەر ناکا**

**ئەوە کێیە لـە جیهانـدا کــە بگرێ جێگای دۆست**

***************





## ئامێزە گوڵێک لە غەزەلیاتی شیرازی

کۆتـا باسـی سـەعدی بـە چـەپکە گوڵـە بـاخێکی دلاوێـزی هەمیشـە گوڵستانی باخی غـەزەلیاتی شـیرین پـەیڤ دەرونمـان فێنـك و گـەردنمان بۆنخۆش دەکـەین، پـڕ بـە ئـامێزێ لـە گـوڵزاری دیـوانی شـێخی ئەجـەل ڕیحانـەی شـێعر و هەسـتی ناسـکی حـەزرەتی ئوسـتاد دەچـنین و بـۆن و بەرامـەی لـە شـار و گونـد دەگێـڕین و پێشکەشـی ئینسـان دۆسـتی و عیشقی پاکانەی دەکەین..[28]

یك نظر بر جمال طلعت دوست

گر به جان می دهند تا بخریم

یـەك نیگا لـە جەماڵی یـارم

ئەگەر بە گیـانیش بێ کڕیارم ؛

---

[28]. شێعرەکانی ئەو بەشە لە کتێبی نوسەردا نین، گوڵچینێکە وەرگێڕ لە تاسەی دیداری دۆست، بە پێی هەست و گەڕانی خۆی بە نێو دیوانی سەعدیدا سەیرو سەفای کردووەو گوڵبژێری کردوون..

گر دلی داری بـــه دلـبنـــــدی بـده

ضایع آن کشـــور کـه سلطـانیش نیسـت

کامران آن دل کـــــه مـــحبوبیش هسـت

درد عشق از تندرسـتی خـــوشتـرست

گر چه بیش از صبر درمـانیش نیســــت

هر که را با ماه رویی ســرخـــوشســـت

دولتی دارد کــــه پـــایـــانیش نیـست

خانه زندانســـــت و تــنهـــایی ضلال

هر که چـون سعـــدی گلستانیش نیست

******

ئەگەر دڵێکت هەیـــە بیـــدە دڵبەنـدێ

زایع ئەو کیشوەرەیە سوڵتـــانی نـــەبێ

کامەرانە ئەو دڵە کە مەحبـــوبی هەبێ

هەرکێ دەگەڵ ماهـ ڕوویێ ســـەرخۆشبێ

بێ شـــك دەوڵەتێکی بــێ پـایانی دەبــێ

ماڵ زیندانە و تەنیـــایی ســـەرگەردانیە

ئەو کەسەی وەکو سەعدی گوڵستانی نەبێ

دیـــدم امـــروز بـــر زمیـــن قمـری

همچـــــو ســروی روان بــه رهـگذری

ئەورۆ لــە سەر زەمین مــانگێکـــم بینی

هەروەك بالاّ چنـــار بـــە ڕێـــدا دەڕۆیی

که گفت در رخ زیبا حلال نیـــست نظر

حلال نیست که بـر دوستــان حرام کنند

کێ وتی نەزەر لە ڕوی جوان حەلاڵ نیە

حـەرام کردنی لـە دۆستـان حەلاڵ نیە

گفتـــــی نظـــــر خـطـــاســـت

تـــو دل مـی بــــری رواســــــت

گــوتت نـەکـــەی نـــەزەر خـــەتـایە

نـــــەی تـــــۆ دڵ دەبــەی ڕەوایە؟!

کسی که روی تـو دیـدست حـال من دانـد

که هر که دل به تو پرداخت صبر نتواند

******

ئەو کەسەی ڕووی تۆی دیوە حاڵی من دەزانێ

هەرکێ دڵ بە تـــــۆ بـدا ئۆقــرەی نامێنێ

مگر تو روی بپوشی و گر نـه ممکـن نیست

کـه آدمـــــی تــــو بینـد نظــر بپوشــاند

مەگەر ڕوی خۆت بپۆشی وەگەرنا مومکین نیە

کـــــەسێ ئەتـــــۆ ببینێ و چاوان لە قوچێنێ

گــر مخیر بکنندم بقیــامــت کە چە خـواهی

دوست مارا و همە نعمـــــت فــردوس شمارا

ئەگەر هەڵمبژێرن لە قیامـــەتـێ چتـــدەوێ

دۆست بۆ مە و نیعەتی فیردەوسێ بۆوە بێ

من ای صبا رە فتن بـــــە کــوی دوست ندانم

تو می روی بە سلامت ســــــلام من برسانی

ئەی سەبا، ڕێی چوونە کۆشکی دۆست نازانم بە کوێدا

سڵاوی من بگەیەنە کە تۆ بە سڵامەت ڕیشتی بە وێدا

ای نسیــــم سحـر از مــــن بـــــــە دلارام بگــوی

که کسی جز تو ندانـــم کـــه بـود محرم دوســـت

ئەی نەسیمی سەحەر لە جیاتی من بە دڵارام بڵێ

جگە لە تۆ کەسی ترم نیە مەحرەمی دۆست بێ

وه که گر من باز بینم چهر مـهر افـزای دوست

تـــا قیامت شکـر گـویـم طـــالع فیروز را

ئۆهـ گەر دەبینمـەوە ڕووی میهری دۆستی خۆم

تاقیامەت دەکەم شوکرانەی بەختی پیرۆزی خۆم

چنان مشتاقم ای دلبر به دیـــدارت که از دوری

برآید از دلـم آهـی بسـوزد هفـــــت دریـا را

هێندەم ئـــارەزوی دیـــدارتـــە دڵـــبـــەرێ

لە دووریان وەختە ئاهێـك لـە دڵم بێتە دەرێ

حـــــەوت دەریـــا و زەریـــا بســـوتێـنـێ

ماه رویـــا روی خـــــوب از مـن متـاب

بی خطــا کشتـــن چـــه بینی صـــواب

ڕووی خۆتم لێ مەشارەوە مانگ ڕوخسارێ
لە بێ خـــەتا کوشتن چیتـدەستدەکەوێ

ایـن بـــاد بهـار بـــوستـــان اســـت
یا بـوی وصـــــال دوستـــان اســـت

ئەوە شنــــەی بـــەهـــاری بۆستانە
یـــا بـــۆنـــی ویســـــاڵی دۆستانە

گوینـد هـوای فصـل آزار خـــوشســـت
بـوی گـل و بانـگ مـرغ گلزار خوشست
ای بیخبران اینهمه بـا یـار خــوشـــت

دەڵێن هـــەوای فەسڵی نـــازارێ خـــۆشە
بۆنی گـوڵ و ئـــاوازی بـولبولان خـۆشە
بێ خەبەران خۆ ئەوە دەگەڵ یاردا خۆشە

آنان کە پـــری روی و شـــکـــر گفتـــارنـد
حیفست کـــە روی خـــوب پنهان دارنـد

ئەوانـــەی پەری ڕوو و شەکر گوفتـــارن

## حـەیفـە ڕوخساری جوانیـان وەشارن

گرفتم آتش دل را خـــبر نمـــی داری

نگـــاه مـــی نکنـی آب چشم پیــدارا

دڵم ئاوری تێبەربوە نەتبیستوە خەبەرێ

تەماشا ناکەی ئاوم لەچاوان دێتە خوارێ

دیده را فایـــده آنست کـه دلبـر بینـد

ور نبیند چـــه بـود فـایده بینایی را

کەڵکی چـــاوان ئـەوە کـە دڵبەر ببینێ

گەرنە لە بینایی چ فایدە کە نەیبینێ

کـــاش آنانکــه عیـــب مـــن جستـنـد

رویــــــــت ای دلستـــان بـدیدندی

تـــا تــــــرنـــــــــج در نظــــــرت

بــــی خبـــر دستهـــا بریدنـــــــدی

خۆزگە ئەوانـــەی تێمدەگـرن تـــــــانێ

ڕووی تــــۆیـــــــان دیبـــــــا دڵستـــــانێ

تــــــــــاوەکـــو لـــــــە جێـــــــــی میـــوە

بێ ئاگـــــــا دەستـــــی خـــۆیـــــان دەبڕیەوە

خبرت هست که بـــــی روی تـو آرامـــم نیست

گاقت بـار فراق ایـــن همـه ایـــامـــم نیسـت

خەبـــەرت هـــەیـــە بـێ ڕووی تــۆ ئارامـــم نیە

تاقەتی فیراقی ئـــەو هـــەمـــوو ڕۆژانـــەم نیە

صحبت یـــــــار عـزیز حـاصـــــل دور بقاست

یك دمه دیدار دوست هـــر دو جهانش بهاست

گوفت و لفتــــی یـــاری عـــەزیز هـۆی بـــەقایە

یەك دەم لە دیداری دۆست دوو دنیای بەهایە

دیـــــــــــدار تو حـل مشکـــلات اســـــــت

صبـــــــــــــر از تو خلاف ممـکنـــــات است

دیـــــــداری تـــــۆ حـــــەلی مـــوشکیـلاتە

سەبر لە بەرانبـــەر تۆ خیـلافی مومکیناتە

درد دل مـــن ز حـــد گـذشــت اســـت

جـانـــــــم ز فــراق بیقـــرار اسـت

دەردی دڵــی مـــن لـە حـــەد تێپــەڕیوە

هـــەڵبـــڕان ئۆقـــرەی لـــە گیـــانـم بڕیوە

شب فراق کە داند کە تــــا سحر چند است

مگر کسی کە بزندان عشــــــق دربند است

شەوی هەڵبڕان کێ دەزانێ تا سەحەر چەندە

مەگین هەر ئەوەی لـە زینـدانی عیشق بەندە

فریـــاد مــن از فـــــــراق یـــار است

و افغـــان مــن از غــــــم نگـــار است

هـــاواری من لـە دەستـــی فیـــراقی یـارە

نـــاڵەی مـــن لە دەستـــی خــــەمی نیگارە

عشق داغیســـت کە تـا مـرگ نیـــاید نـرود

هرکه بـــر چهـــره از این داغ نشـانی دارد

عیشق داخێکـه، تا مەرگ نەهیـــێ نـــاڕوا
ئاشقان نیشانەی داخیان دیاره لـه ڕوودا

تنهـا دل منست گـــرفتـــار در غمان
یاخود در این زمانه دل شادمان کم است

هـەر دڵی مــن گرفتــاری خـــەمانه
یا دڵـــی شـادمان کـــەمه لـەو زەمانه

کسی که روی تو دیـده است حـال من داند
کـه هر که دل به تو پرداخـت صبر نتواند

کەسێ کەڕوی تۆی دیــوه حـــاڵی من دەزانێ
هەر کێ دڵ به تـۆ بـــــدا ئۆقـرەی نـامێنێ

آفـــــــرین خـــدای بـــر پـــــدری
کـــه پـــرورد و مـــــادری کــــه تـــو زاد

ئافەرین بۆ پەروەردەی ئـەو بـاوکـه، خودایه

**بۆ ئـەو دایکەی تـۆی هێنایە سەر ئەو دونیایە**

**دیدار یار غـــایـب دانــی چـــه ذوق دارد**

**ابری کـــــه دربیابـــان بــر تشنه ای ببارد**

**دیداری یاری غایب دەزانی چ لـــە زەتێکی هەیە**

**وەکو هەورێکە لە بیابان بۆ تینوویەك ببارێنێ**

**گفتم به گوشــــەای بنشینم چـو عاقلان**

**دیــــوانه ام کنــــد چو پـری وار بگـذرد**

**گوتم لــە قوژبنێکدا دانیشــــــم ئاقـلآنە**

**لێ، کە پەری وێوە دەڕوا خۆ دەبمە دیـّوانە**

**کیسن آن مـــاه منور که چنیـــن میگـذرد**

**تشنه جان می دهد و ما عـعیـــن میگـذرد**

**ئەوە کێە ئەو مانگی منەوەرە وەها ئێدەپەڕێ**

**تینوو گیان دەداو ئاوی ڕەوانــیش دەگوزەرێ**

**گر مـــــن زەمحبتــــــت بمیــــــرم**

## دامـــــــن بقیـــامتــت بگیـــرم

ئەگەر لــە خــــۆشـەویستی تــۆدا بمرم
لــــــە قیــامــەتـــێ داوێنت دەگـــــرم

آبی ســــــت محبـــــــت تـــو گـــویی
کـــــــآمیختە انـــــد بـــا گـــل مــن

موحیبەتی تۆ نـاوێکە هـــــــــەر دەلێی
دەگەڵ قورەکــــــەی منـدا شێـــــــلراوە

خوشست درد کە بــــاشـد امید درمانش
دراز نیست بیابـــــان کـــە هست پایانش

خۆشە دەردێك کە هومێدی دەرمانی هەبێ
درێژ نیە بیابـــانێ کــــــە پایانی هەبێ

رنگ رویم غــم دل بــا همە کس میگویــد
فاش کرد آن کـــە ز بیگـــانە همــی بنهفتم

ڕەنگی ڕووم خەمی دڵی بە هەمـــووان دەڵێ
بلاوەی پێکرد هەرچی لە بێگانەم دەشاردەوە

سخنها دارم از دست تو بر دل
ولیکن در حضورت بی زبانم

چەندم قسە دە دڵدایە بۆ تۆ
وەلێ بێ زمانم لە حزوری تۆ

گفته بودم چو بیایی غم دل با تو بگویم
چه بگویم که غم از دل برود چون تو بیایی

وتبووم خەمی دڵت بۆ باسدەکەم گەر بێی
چ بڵێم خۆ خەم لە دڵی دەڕوا کە تۆ بێی

وه که در عشق چنان میسوزم
که بیک شعله جهان میسوزم

نۆهـ ! لە عیشقدا چۆن دەسوتێم
خۆ بە یەك پۆلو جیهان دەسوتێنم

آن نه رویست که من وصف جمالش دانم
این حدیث از دگری پرس که من حیرانم

ئەو ڕووە نیە کە وەسفی جەماڵی دەزانــم
لە یەکێکی دی بپرسە ئەمن کە حەیرانم

هزار جهد بکردم کـــه سر عشــق بپوشم
نبود بر سر اتش میســرم کـــه نجوشم

هــەزار هــەوڵمدا ڕازی عـیشق بـپۆشـــم
ئاگرێ لە سەر ئاور بم و لە ئاوەوە نەجۆشم

بهوش بـــودم از اول کــه دل بکــس نسپارم
شمایل تو دیدم نه صبر مـــاند و نه هوشم

هەوەڵ بە هۆش بووم دڵ بە کەس نەسپێرم
چـاکی تــۆم دی نــــە سەبر ماو نە هۆشم

نمـــــاز کردم و از بیخـــــودی نـدانسم
که با خیال تو عقد نمـــــاز چـون بستم

نوێژم کــرد و نەمزانی لە بێ ئاگایی خۆمدا
چـۆنم دابەســـت دەگەڵ خــەیـاڵـی تــۆدا

نماز بیخودی از روی شـرع جایـز نیـست
نماز من که پـزیرد کـه روز و شـب مستم

نوێژی بێخودی لـە ڕووی شـەرع جـایز نیە
نوێژی من قبوڵە ڕۆژو شـەو ئاگام لەخۆ نیە

حدیـث روضـه نگویـم گـل بهشت نبویـم
جمال حور نجویم دوان بسـوی تو باشم

باسی ڕەوزە ناکەم، نامژم بۆنی گوڵی بەهەشتێ
نـاڕوانمە جەماڵی پەری کـە تۆم لێ دیاربێ

مـی بهـشت ننوشم ز جـام سـاقی رضوان
مرا به باده چه حاجت کـه مست روی تو باشم

پیاڵەی ڕیزوان وەرناگرم مەیی بەهەشتێ نانۆشم
چە ئیحتیاجم بە بادە کە مەستی ڕووی تـۆ بـم

چه بویست آنکه عقل از من ببردو صبرو هوشیاری
ندانم بـاغ فـردوس است یا بـازار عطـاران

چ بۆنێکە ئەقڵ و سەبر و هۆشیاری لە من بڕیوە
نازانم باخی فیردەوسە یـا بازاڕی عەتر فرۆشـانە

وفای یـار بـه دنیـا و دیـــــن مـــده سعـدی
دریغ باشــد یوســـــف بهـرچــه بفـروش

سەعدی بە دنیا و دینی مــەدە وەفــای یــارێ
حەیفە، یوســف لەبــەر چــی دەفرۆشــرێ؟

نه عجب کمال حسنت که به صـــد زبان بگویم
کــه هنوز پیش ذکرت خجلــــــم ز بی زبانی

عەجەب نیە کەماڵی حوسنت بە سەد زمان بڵێم
ئەوێستاش لە باستدا لــە بێ زبانی دەخەجڵێم

به گفتن راســت نـــاید شـــرح حسنـت
ولیکن گفت خواهـــم تـا زبــــان هســـت

شەرحی حوسنـت بــە زبـان نــاگــوتـــرێ
وەلێ هەر باســی دەکـــەم تـا زمــان بمێنـێ

ای بــاد صبحـــدم خبـــر دلستـــان بگـوی
وصف جمــــال آن بــت نـامهربـــان بگـوی

ئەی شنــەی دەمبەیان خـەبەری دڵستان بڵێ
وەسفی جەماڵی ئــەو بتی نـامیهرەبــان بڵێ

بگذار مشك و بــــوی سـر زلـف او بیــار
یاد شکــر مکــن سخــن زان دهــان بگــوی

لە میسکێ گەڕێ بۆنی سەری زوڵفی یار بێنە
باسی شەکر مەکە قسەیەك لـەو لێوی بێنە

مــــن آدمی به لطـف تــو دیگر ندیده ام
این صورت صفت کــه تو درای فــرشته ای

کــــەســـم بــەو لوتــفـــەی تــۆ نەدیوە
ئەو وێنەی ئەتۆ هەتـــە فریشتە نەخشیوە

ای غایب چشــم و حــاضــر دل چونی
وی شــاخ گل شکفته در گــل چــونی

ئەی غایب لە چاوان، حازری نێو دڵ چۆنی
وەی پەلکە گوڵی پێکەنیوی خــاك چۆنی

رفیق مهـــــرەبـــان و یـــار هــمـــــدم

همە کس دوست مـی دارنـــد و مـــن هم

ڕەفیقی میهرەبان و یـاری هـــەمـدەمم

هەموو کەس خــۆشیـانـدەوێ دەگـەڵ من

زنـدە بـــی دوســـــت خفتــــە در وطنی

مثــل مـــــــردە ایســــــــت در کـفنـــی

ژیانی بێ دۆست هەر خەفەتە لە نیشتیمانێ

وەکو مردوو وایـە لە ڕاکشـاوە دەنێو کفنێ

ساية



به کەلکی چی دێ داوێنە گوڵێ
لە گوڵستانی من ببە چەند چڵێ
گوڵ هەر پێنج شەش ڕۆژان دەمێنێ
گوڵستانی من دایم خۆش دەمێنێ

# سەعدی شیرازی